# عەبدوڵڵا پەشێو

# ئەستێرە گەشەی سەر قەڵا



نیگاری: قەرەنی جەمیل


ڕۆڤار

36

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات

SARA

# ڕۆڤاری ئەمجارە

وتیان: با ئەم ژمارە تازەیەی "ڕۆڤار" بۆ شاعیرێ یان نووسەرو ڕووناکبیرێکی بەسەر زیندوو تەرخانبکەین!. وتم: بۆنا؟! بەڵام خۆ ئەمە یەکەم جاریشمان نییەو، وەك ئەزانن، لەوەوبەر چەندین ژمارەمان بۆ هەندێ لەو ئەدیبانە تەرخانکرد کە لە ژیاندان و بەچاوی خۆیان ڕۆڤاری خۆیان بینی. وتیان: کەواتە بائەمجارە، لەسەر خۆت بێ و ڕەوایشە!. وتم: ئەمەیان نا. چونکە من بۆ خۆم خاوەن ماڵم و خاوەن ماڵیش ئەگەر خۆی ڕێز لە خۆی بگرێ و ئاهەنگ بۆ خۆی بگێڕێ و ڕۆنی خۆی بداتەوە لەڕیش و سمێڵی خۆی، ناجۆرەو پەسەند نییەو، چاکتروایە بۆ هەر داهێنەرێکی تربێ و بەڵام بۆخۆم نەبێت!

وتیان: ئەی باشە بۆکێ؟!

تۆزێ ڕامام و لەدواییدا وتم: بۆ عەبدوڵڵا پەشێوی شاعیر! وتیان: گەلێ باشە. بەڵام لە ڕاستیدا ئێمە چاوەڕێی ئەوەمان نەئەکرد تۆ وابڵێی، چونکە ئەزانین لەدەمێ ساڵەوە، بەینتان ساردەو پەیوەندی جاری جارانتان نەماوە!.

وتم: ڕاستە. بەڵام چەند جوانتر و شارستانی تر و شاعیرانەترە ئەو سنوورانە بشکێنین و لە چاوی شیعرو ئەدەبەوە تەماشای ئەو هەقە بکەین و واز لە مەسەلە شەخسیەکان بهێنین و بەینی سارد و گەرم نەکەینە پێوانە!. وتیان: لە دنیای ئاڵۆز و پڕ لە ناتەبایی ئەدبیاندا، ئەمە هەنگاوێکی تازە و شەفافیەتێکی ڕاستەقینەیە، وتم: ئەمە هیچ منەتێکی تێدا نییە. چونکە بەر لە هەرشت، پەشێو بە داهێنان و شاعیرێتی خۆی و دەوری لەبەرچاوی لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا ئەم ڕێزو خۆشەویستیەی خۆی سەلماندوە و ئەوەی ئێمەش ئەیکەین ڕێزلێنانێکە لەو ڕۆڵو دەورەی ئەو. وتیان: ئیتر لەم دەقیقەیەوە، دەستبەکارئەبین و ژمارەی تازەمان بۆ عەبدوڵڵا پەشێوی شاعیر ئەبێ. خەریکبوون بڕۆن. وتم لە بیرتان نەچێت، بۆ ناونیشانی سەر بەرگی ڕۆڤاریش. بنووسن:

عەبدوڵڵا پەشێو

ئەستێرەگەشەی سەر قەڵا!.

**شێرکۆ بێکەس**



## هونەرمەند قەرەنی جەمیل

١٩٥٤ لە شاری هەولێر لەدایکبووە.

١٩٧٧ پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی تەواو کردووە لە بەغدا.

چەند پێشانگای تایبەتی و گەلێ پێشانگەی هاوبەشی کردۆتەوە لە ولات و دەرەوەی وڵات.

نێستاش لە هەولێر دەژی و سەرنووسەری گۆڤاری شێوەکارییە.

# ژمارەکانی ڕابردوو

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەڕەم محەمەد ئەمین، دڵدار، مەستوورەی ئەردەلانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیززەت، فایەق بێکەس


سەرپەرشتیاری گشتی

شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکار

ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار

یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری

قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر

یادگار ئەوڕەحمان

سەرپەرشتیاری چاپ

فەرهاد ڕەفیق

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێك دەریدەکات



ناونیشان

سلێمانی - فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ت: ٣١٢٩٦٠٩

لە دەرەوەی وڵات

Tel: 00441628477660

Fax: 00441628486008

Web Site

www.sardam.info

Email

Sardam@sardam.info



چاپخانەی (ڕەنج)

## عەبدوڵلا پەشێو

# قەیرانی شووناس لەکەلتووری خوێن و پێترۆڵدا

عەتا قەرەداخی



**یەشی یەکەم**

یەکێك لەشیعرە دیارەکانی عەبدوڵلا پەشێو ئەو شیعرەیە کە بۆ بیرمەندی دیاری عیراقی (هادی عەلەوی) گوتووەو لەو شیعرەدا وەسفێکی قوڵی کەسێتی عەلەوی دەکات لەپای هەڵوێستی مرۆڤانەی سەبارەت بەسیاسەت و رەفتاری رژێمی تۆتالیتاری عیراقی بەرامبەر بەکورد، پەشێو لەم شیعرەدا کۆمەڵێ پرسیاری پڕ بایەخ بەرز دەکاتەوە بەرامبەر بەکەسێتی عەلەوی و مێژووو کەلتوری ئەو نەتەوەیەی کە عەلەوی ئەندامێکە لێی، هەروەها بابەتی دان پێدانان و پاکانە وەکو دوو چەمکی مرۆڤانەی پەیوەست بەقۆناغی ژیانی کۆمەڵگای شارستانی دەخاتەڕوو، هەروەك لەپاڵ ئەوانەشدا وەسفێکی قوڵی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی و عەقڵی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی دەکات کە لەوەشدا لەئاستی نەگوتراودا بنەمای جۆرێك لەبەراورد لەنێوان کۆمەڵگەو عەقڵی رۆژهەڵاتی و رۆژئاواییدا دەردەکەوێت.

**دەقی شیعرەکە:**

تۆ لەسەردەمی کورتە باڵایان
باڵای بەرزی خۆت لەکوێ هێناوە؟
تۆ لەسەردەمی قاتی و نەهاتا
وەرزی سەوزی خۆت لەکوێ هێناوە؟
لەبەر خرینگەی
شیرو.. زرینگەی
ئاڵتونی قورەیش
چۆن گوێت لەناڵەو نرکەی عەلی بوو؟
چۆن لەبەر ژاوەی ئایشەو حەفسان
گوێت لەسکاڵای ماریەی قیبتی بوو؟

***

خۆ سەدەکانی ئێمە هەموویان
لکی درەختی چاخی جاهیلین
کڵێسەو مزگەوت
شوراو پەرلەمان،
بارەگاو دیوان،
هەموو بازاڕی گەرمی عوکازن..
نابیغەکانیش هەمان نابیغەن.
خودایان ورگە.. نەوەی بەرازن،
لەملا بەرزکی شای غەساسینە باوەشێن دەکەن،
لەولا بۆ بنپێی شای مەنازیرە وەک بەردەبازن.

***

لەرۆژهەڵاتی رۆژ لەبن پێدا
لەرۆژهەڵاتی
دەستنوێژ هەڵگرتن بەخوێن و پێترۆڵ
لەرۆژهەڵاتی
مارە بەجاش و
رشک و ئەسپێدا
لەو رۆژهەڵاتەی
نامووس فیرارەو
پەنابەرێکە لەناو دەرپێدا،
سەرم سوڕماوە،
چۆن توانیت گەورەم
بێدەنگی قانگ دەی؟
تۆ چۆن زاتت کرد
ئەو کولەکەیە بدەی بەعەرداو
پڕ بەدەنگ بانگ دەی
ئەی رۆژهەڵاتی کورتە باڵایان،
ئەم باڵا بەرزەت سەد جار پیرۆزبێ
ئەی چاخی قاتی و ساڵانی نەهات
ئەم وەرزە سەوزەت سەد جار پیرۆز بێ

پێش هەر ئاخاوتنێك لەسەر ئەم دەقە شیعرییەی عەبدوڵلا پەشێو، ئەوەمان لا ئاشکرایە کە پەشێو یەکێکە لەدەنگە دیارەکانی شیعری کوردی دوای گۆران، کە لەڕووی جیهانبینی و زمانی شیعرییەوە سەر بەهەمان ئەزموونی شیعری ئەو قۆناغەیەو لەڕووی بنیادی شیعری و پرسیاری شیعریشەوە تا ئەندازەیەکی ئاشکرا لەئەزموونی شیعری لەتیف هەڵمەتەوە نزیکە یان باشتر بڵێین هاوشێوەن، دیارە هاوکاتیش زمانی پاراوو بێگەرد و وێنەی سادەو زۆرجاریش کاریگەرو سەرنجڕاکیش ئەو پایانەن کە گوتاری شیعری ئەم شاعیرەیان بەرهەم هێناوە کە زیاتر گوتارێکی سیاسییە، کە گەوهەری ئەم گوتارەش پەیوەستە بەکەسێتی کوردی و مەسەلەی کوردی و ئاسۆی ئایندەی کوردەوە.

ئەگەر سەرنجی بەرهەمەکانی پەشێو بدەین بەگشتی دەقەکانی کورتن، ئەوەش بەگشتی پەیوەندییان هەیە بەجیهانبینی دەقەکانەوەو بەگوتاری شیعری ئەم شاعیرەوە کە گوتاری کوردییە، مەودای جیهانبینی دەقەکان لەسنووری مێژوو و سیاسەتی کوردیدا دەسوڕێنەوەو بەشێکی زۆریان کاردانەوەن بۆ سیاسەت و هەڵسوکەوت و رەفتاری ئەوی دی (داگیرکەران) بەرامبەر بەکورد، بەمانایەکی دی، هێزی بەرهەمهێنی زۆربەی دەقەکان پاڵنەری کاردانەوەیە، نەك پرۆژەیەکی فیکری یان مەعریفی کە لەچوارچێوەی زمانی شیعریدا گوزارشت لەخۆی بکات، ئەم شێوازە دەربڕینەش بەرجەستەکردنێکی ریالیستانەی واقعی سیاسی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی و کەلتوری و عەقڵی کوردییە کە لەهیچکام لەو بوارانەدا مێژووی ئێمە هەڵگری پرۆژەی درێژخایەن نەبووە، هەر ئەوەش وای لێکردووە کە بەپێی رۆیشتنی کات ئامادەبوونی بەردەوامی نەبێت، بەڵکو

لەئاستی سنووردارداو لەماوەی کورتخایەندا هەندێ جار دەربکەوێت، تەنانەت نەبووەتە بکەرێکی رووداو دروستکەری ئەکتیڤ کە توانای سەلماندنی خۆی هەبووبێت، کورتی دەقەکانی پەشێو لەڕووی بنیادی زمانەوەو هەر بەو پێیەش بەرهەمهێنانی ماناو دەلالات بەبێ پێکهاتەی زمانی وەکو (دال) هاوشێوەیە لەگەڵ مێژووی پچڕ پچڕی ئێمەدا، مێژوویەك کە ئاڕاستەی هەڵکشانی بەرەو لوتکە تێیدا ونەو سەرباری باری پچڕ پچڕی لەسەر شێوەی بازنەیی دەجوڵێت، ئەم شیعرەی پەشێو کاردانەوەیە بەرامبەر بەهەڵوێستی مرۆڤانەی دوور لەهەستی شۆڤێنی بیرمەندی دیاری عیراقی هادی عەلەوی کە بێبەری بوونی خۆی لەڕژێمی تۆتالیتاری بەعسی عەرەبی و لەسەرکردەی شۆڤێنی ئەو ئاراستەیەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و تەنانەت بێ لایەنبوونی خۆی لەناسنامەی عەرەبیش ڕاگەیاند لەبەرامبەر ئەو کارە دژ بەمرۆییانەی کە ئەو ناسیۆنالیزمە بەرامبەر بەگەلی کورد بەگشتی و لەهەڵەبجەدا بەتایبەتی کردی، وەك ئاماژەمان بۆ کرد ئەم دەقە لەئەنجامی کاردانەوەدا بەرهەمهاتووە، بەڵام دەقێکە لەڕووی مێژوویی و کەلتووری و بنەماکانی یەکتر قبوڵ نەکردن و قەیرانی ماف و دادپەروەرێتییەوە بایەخێکی زۆری هەیەو چەندین هێمای مێژوویی لەخۆگرتووەو چەندین ماناو دەلالاتیش لەسنووری ئەم دەقەدا بەرهەمدێت.

-٢-

پەشێو باسی سەردەمێك دەکات کە بەسەردەمی کورتە باڵاکان وەسفی دەکات، ئەو سەردەمە لەڕووی مێژووییەوە ئەو سەردەمەیە کە تیایدا بەهای مرۆڤ و مرۆڤایەتی رووخێندراوەو مرۆڤ کە لەڕاستیدا بەهادارترین سەرمایەی گەردوونەو بەهێزترین بوونەوەرە ئەویش بەهۆی ژیرییەوە، لەو مێژووەدا کە شاعیر باسی دەکات گەوهەرو ماهیەتی خۆی لەدەستداوەو بووەتە پێکهاتەیەکی لاوازو نائامادەو ناکردە، ئەویش لەبەرامبەر هێزی پڕ لەنهێنی گەردووندا نا، بەڵکو لەبەرامبەر ئەو دەسەڵاتانەی کە خۆی بەرهەمی هێناون، بەجۆرێك کە بێدەنگی و ملکەچی و خۆبەدەستەوەدانی بۆ ئەو دەسەڵاتانە ئاشکراو لەبەرچاو بێت، ئەو قۆناغەی کە ئەو لێی دەدوێت قۆناغێکی کورت نییە، بەڵکو هەموو ئەو مێژووە دەگرێتەوە کە مرۆڤ ئازادی مرۆڤی تیا داگیرکردووە، کە دەستەو ئیتنیکە جیاوازەکان لەڕێگەی بەدەستهێنانی دەسەڵاتەوە هەموو توانای خۆیان خستۆتەکار بۆ کوشتنی بوون و ئازادی ئەوانی دی، ئەو سەردەمە کە مرۆڤ لەڕێگای بەدەستهێنانی دەسەڵاتەوە هەوڵی کوشتنی ئازادی ئەوانی تر دەدات، مانای وایە پرۆژەی کوشتنی ئازادی جێبەجێدەکرێت کە لەمەشدا تەنیا (قوربانی) ئازادی نادۆڕێنێت، بەڵکو جەلادیش ئازادی خۆی دەدۆڕێنێت، کەواتە کۆمەڵگا بەگشتی ئەو زەمینەی لەدەستدەچێت کە بنەماکانی بوونی تیا فەراهەم دەبێت، هەموو ئەوانەی کە ئازادی دەکوژن هەموویان مرۆڤی قەزەم و ئیفلیجن بەو پێیە لەم سەردەمەدا کە ئازادی جگە لەوەهم شتێکی تر نییە نەك هەر لەوڵاتەکانی هادی عەلەوی و پەشێودا، بەڵکو لەڕۆژهەڵاتدا بەگشتی، لەئاستی دووەمدا ئەوانەی بەبەرچاویانەوە ئازادی دەکوژرێت و بێدەنگن ئەوانیش کورتەباڵان، لەئاستی سێیەمدا ئەوانەی سەر بەنەتەوە یان ئیتنیکی دەسەڵاتدارن و نەتەوەکەی ئەوان ئازادی دەکوژێت و رۆڵی جەلاد دەبینێت و کەچی ئەوان بەرامبەر بەو رەفتارە دژ بەمرۆڤانەی کە دەسەڵاتی نەتەوەکەیان دەیکات ئەمان بێدەنگن و رازین، هەمان ناسنامەی ئەو جەلادەیان هەبێت ئەوە ئەوانیش دیسان بستە باڵان، هادی عەلەوی ئەو کەسەیە کە بێبەری بوونی خۆی لەو نەتەوەیە رادەگەیەنێت کە دەسەڵاتەکەی یان ناسیۆنالیستەکەی ئازادی ئەوانی تر دەکوژێت و خۆی دەبێتە جەلادو ئەوانی دیش دەکاتە قوربانی، لەم روانگەیەوە ئەگەر کارکردن بۆ فەراهەم کردنی ئازادی بەهەنگاونان بەرەو پێگەیشتن و گەیشتن بەڕۆحی رەهای کۆمەڵگا دابنرێت و لەو ئاقارەشدا کە ئازادی دەستەبەر دەبێت مرۆڤی تەواو پێبگات، ئەوا لەنەبوونی ئازادیدا هەم جەلادو هەم قوربانی هەردووکیان دەبنە مرۆڤی ناتەواو، پەشێو لەسەردەمێکدا کە ئازادی بوونی نییەو بەو پێیەش مرۆڤی تەواو دروست نابێت، باس لەبوونی مرۆڤێکی تەواو دەکات، مرۆڤێك لەئاستی یەکەمدا خۆی لە(گشت) جیادەکاتەوەو ناسنامەی تاکەکەسی خۆی بەدەستدێنێت، بەمانایەکی دی لەقۆناغی قەیرانی شووناس و دروست نەبوونی کەسێتیدا مرۆڤێکمان بۆ بەرجەستە دەکات کە خاوەنی کەسێتییەو بەو پێیەش شووناسی هەیە، شووناسی مرۆڤی تەواو.

-٣-

تۆ لەسەردەمی کورتە باڵایان
باڵای بەرزی خۆت لەکوێ هێناوە؟
تۆ لەسەردەمی قاتی و نەهاتا
وەرزی سەوزی خۆت لەکوێ هێناوە؟

لەسەردەمێکدا کە قەیرانی شووناس و کەسێتی دەسەڵاتی بەسەر واقیعدا کردووە، بەجۆرێکی ئەوتۆ کە دەشێت ئەو سەردەمە بەپێی ئەو قەیرانە ناسنامەی بۆ بکرێت کە ئەویش سەردەمی بێ ناسنامەیی یان سەردەمی ونبوونی شووناس یان سەردەمی رووخاندنی کەسێتییە، لەبارودۆخێکی وەهادا (هادی عەلەوی) لەڕوانینی پەشێوەوە خۆی لەهەموو ئەوانی عەرەب جیادەکاتەوەو لەسەر بنەمای بەدەستهێنانی (جورئەت)، ئەو پەیوەستبوونە ئیتنیکە رەتدەکاتەوە کە ئەوو ئەو جەلادانە پێکەوە دەبەستێت کە جینۆسایدی میللەتێك ئەنجام دەدەن، بەمانایەکی دی عەلەوی هێندە بەسووك سەیری ناسنامەی جەلاد دەکات کە پێی شەرمە ئەوو جەلاد لەیەك رەگەز بن، هەر ئەوەش وای لێدەکات کە دوو هەڵوێست لەیەك کاتدا نیشان بدات، یەکەمیان رایدەگەیەنێت کە ئەوو ئەو جەلادانەی کە تاوانی جینۆساید ئەنجام دەدەن بەرامبەر بەمیللەتێك کە مێژوو کردوویەتی بەقوربانی هەمیشەیی، لەیەك رەگەز نین، یان باشتر بڵێین ئەم بەرائەتی خۆی لەو رەگەزو مێژوو و کەلتوورە رادەگەیەنێت کە جەلاد بەرهەمدێنێت، دووەمیان، پاکانە بۆ ئەوی قوربانی دەکات و نەفرەت لەو مێژووەش دەکات کە کردوویەتی بەقوربانی و هەر

رۆژەی بەجۆرێك لەبەردەم چەقۆی جەلاددا رایدەگرێت.

دیارە ئەم روانینە روانینی ئاشکرای خودی شاعیرەو عەلەوی کراوەتەوە مەبەست یان هۆکار بۆ بەرجەستە بوونی ئەم بۆچوونە، پەشێو لەئاستی نەگوتراوی دەقەکەدا کورد بەراورد دەکات بەیەکەمین قوربانی واتە بەئیسماعیل، بەڵام قەسابەکەی ئیسماعیل باوکی بوو، فەرمانی بەقوربانی کردنیش لای خواوە هاتبوو، ئیبراهیم لەپێناوی رازیکردنی خوای خۆیدا ئامادەبوو کوڕەکەی خۆی بکات بەقوربانی، دیارە ئیبراهیم لەنێوان دوو هەڵوێستدا رامابوو، هەڵوێستی بەجێهێنانی فەرمانی خوداو هەڵوێستی ئازاری کوشتنی پارچەیەك لەجگەری خۆی، هەر ئەوەش وامان لێدەکات کە وەها سەیری ئیبراهیم بکەین کە هەرچەندە لەڕووکەشدا وەکو جەلاد دەردەکەوێ، بەڵام لەڕاستیدا ئەویش قوربانییە، قوربانی بارودۆخێك کە ناتوانێت لێی یاخی ببێت، بەڵام بەگوێرەی ئەو بارودۆخەی کە پەشێو کردویەتیە پایەی بەرهەمهێنانی دەقەکەی و عەلەوی کردۆتە پاڵەوانی بەرجەستەکەری ئەو واقیعە مەسەلەکە جیاوازە، ئەوی دیکتاتۆرو ناسیۆنالیزمی عەرەبی و عەقڵ و کەلتوورو مێژووی ئەو ناسیۆنالیزمە لەبوونیاندا بەڤایرۆسی کوشتن و سڕینەوەو لەنێوبردنی ئەوانی دی بارگەکراون و بۆ جێبەجێ کردنی ئەو پڕۆژەیەش کە پڕۆژەی پاکتاوی ئەوانی دییە هەرگیز لەگوماندا نەبووەو هەرگیزیش ویژدانێك نەبووە لەناوەوە وریایان بکاتەوەو بیانجوڵێنێت بۆ دوورکەوتنەوە یان پاشەکشەکردن یان پەشیمان بوونەوەیان لەو کارە ترسناکانەیان، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەوڵیانداوە ئەو کارە ترسناکانەیان بخەنە چوارچێوەی ئایینەوەو پیرۆزیشی پێ ببڕن،کەواتە هیچ روویەکی لێکچوون لەنێوان ئیبراهیم و ئەوی دیکتاتۆرو ناسیۆنالیزمی عەرەبیدا دروست نابێت، هەروەك لێکچوون لەنێوان ئیسماعیل و کوردیشدا دروست نابێت، ئیسماعیل لەبەر باوکی و ملکەچی بۆ ئەوی باوك بەناچاری ملی دا بۆ ئەوەی بکرێتە قوربانی، بەڵام ئەمی کورد دوور لەویستی خۆی و دوور لەرازیبوونی خۆی بەزەبری هێزو نەفرەتی مێژوو، لەپێناوی بەرژەوەندی هاوبەشی جەلادی جۆراوجۆردا لەقۆناغێکی مێژوویيدا ناسنامەی قوربانی بۆ کراوەو ئەو ناسنامەیەش وەکو نەفرەت تیکەڵاوی رۆحی بووەو لێی رزگار نابێت.

لەکاتێکدا کە عەلەوی لەهەمان رەگەزی ئەوی جەلادە، پاکانە بۆ خۆی دەکات کە ئەو دژی کارەکانی ئەو جەلادەو ئەو کەلتوورو عەقڵیەتەشە کە جەلاد بەرهەمدێنێت، پەشێو پێی وایە هەموو جەلادەکان مرۆڤی ئیفلیجن، دیارە ئیفلیجی جەستەیی نا، بەڵکو ئیفلیجی عەقڵی و دەروونی، بەهەمان شێوە ئەوی قوربانیش هەر بەئیفلیج دەبینێت، بۆیە بەگشتی ئەو سەردەمە بەسەردەمی مرۆڤی ئیفلیج ناودەبات، ئەوی جەلاد ئیفلیجە لەو روانگەیەوە کە دەیەوێت لەڕووی هێزەوەو بەکوشتن و بڕینەوە بوونی خۆی بسەپێنێت و لەو رێگایەوە گرێی کەموکورتی خۆی پڕ بکاتەوە، ئەوی قوربانیش ئیفلیجە لەو روانگەیەوە کە ناتوانێت دەنگی خۆی بەرز بکاتەوەو لەڕووی جەلاددا بوەستێت ئیتر گرنگ نییە چ بارودۆخێك ئەوی کردۆتە قوربانی.

پەشێو ئەو قۆناغە مێژووییە بەقۆناغی پیارە کورتە باڵاکان ناو دەبات و پێی وایە کەس پڕکێشی ئەوە ناکات پەردە لەسەر راستییەکان لاببات، چونکە سرۆڤی تەواو دەتوانێت کارێکی لەو جۆرە بکات، لەو زەمینە قەیراناویەدا هادی عەلەوی وەکو مرۆڤێکی تەواو دەردەکەوێت و پەردە لەڕووی راستی لادەدات و بەوەش لەسەردەمی پیاوە قەزەمەکاندا ئەم وەکو باڵا بەرزێك دەردەکەوێت- بەواتا شروناسی مرۆڤی تەواو بەدەست دەهێنێت- ئەمەش ئەو دەلالەتە هەڵدەگرێت کە تەنیا مرۆڤی تەواوە دەبێتە خاوەنی ناسنامە، مرۆڤی تەواویش ئەو کەسەیە کە خاوەنی جورئەت و پڕکێشی بێت وەکو هادی عەلەوی.

لەبەر خرینگەی
شیرو.. زرینگەی
ئاڵتوونی قوڕەیش
چۆن گوێت لەناڵەو نرکەی عەلی بوو؟
چۆن لەبەر ژاوەی ئایشەو حەفسان
گوێت لەسکاڵای ماریەی قیبتی بوو؟

شاعیر دەمانگێڕێتەوە بۆ مێژوویەکی تا ئەندازەیەك دوور کە مێژووی سەردەمی پێغەمبەری ئیسلامەو دەیەوێت پەیوەندییەك لەنێوان ئەو مێژووەو مێژووی کیمیایی بارانکردنی کوردستان و پاکتاوکردنی رەگەزی کورددا دروست بکات، لەم پەیوەندی دروستکردنەشدا مەبەستی ئەوەیە بێ عەدالەتی و نایەکسانی و پێ نان لەماف و چارەنووسی کەسانێك یان نەتەرەیەك دەربخات، ئەوەش هەروا بەسادەیی و وەکو رووداوێکی راگوزاری باسی ناکات، بەڵکو دەیبەستێتەوە بەکارکردنی عەقڵ و کەلتوورێکەوە کە رەگ و ریشەیەکی قووڵی هەیەو کاریگەری ئەو عەقڵ و کەلتوورە لەکۆنەستی کۆمەڵایەتی هەموو نەتەوەکەی هادی عەلەوی بەتایبەتی و هەموو رۆژهەڵاتدا بەگشتی جێگیرە. شاعیر سەردەمی دەسەڵاتی دیکتاتۆری بەغدا هاوشێوە دەکات بەسەردەمی پێغەمبەر، ئەویش لەو روانگەیەوە کە سەردەمی پێغەمبەر دابەش بووە بۆ دوو جۆر لەپەیوەندی یان دوو ئاستی جیاواز لەپەیوەندی پێغەمبەرو هاوەڵانی کە سەرەتا وەکو قوربانی دەرکەوتوون لەبەرامبەر ئەوی قوڕەیشدا کە بەرامبەر بەپێغەمبەرو هاوەڵانی دەوری جەلادییان بینیووە، بەواتا ناسیۆنالیزمی عەرەب و جەلادانی بەغدا هاوشێوەی قوڕەیشن، کوردیش هاوشێوەی پێغەمبەرو هاوەڵانیەتی، بەڵام ئەو هاوشێوەکردنە لەئاستی بینراوی دەقەکەدا بوونی نییەو هەروەك لەئاستی نەبینراویشدا لەبەردەم لێکدانەوەیەکی تردا لاواز دەبێت و تا ئەندازەیەك پاشەکشە دەکات، ئەویش

ئاخاوتنە لەسەر مەسەلەی عەدالەت لەنێو پێکهاتەی هاوەڵانی پێغەمبەرو ئەندامانی خێزانەکەیدا، شاعیر (هادی عەلەوی) دەکاتە چاودێری ئەو مێژووەو لەڕووی بەراورد کردنەوە دەیگێڕێتەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەرو ئەو پرسیارەی ئاراستە دەکات کە ئایا لەو مێژووە تاریك و پڕ لەکێشەو پڕ لەویستی سەروەت و سامان و کارکردن بەعەقڵی شمشێردا چۆن ئەم توانییەتی دەنگی حەقی عەلی کوڕی ئەبوتالیب ببیستێت؟ دەنگی عەلی دەنگی عەدالەت خوازانە لەسەرەتاوەو لەپاشانیش دەبێتە دەنگی قوربانی، ئایا لەسەردەمی بەقوربانی بوونی عەلی-دا عەقڵێك هەبووە کە گوێبیستی ناڵەی عەلی بێت و لەگەوهەرو ماهیەتی غەدر تێبگات؟

ناڵەو نرکەی عەلی دەشێ مەبەست تەنیا لەساتەوەختی شەهیدکردنی نەبێت، بەڵکو زیاتر قسەکردن بێت لەسەر ئەو مێژووەوەی کە ئیمامی عەلی تێیدا ژیاوەو چۆن خێڵی قورەیش سەرگەرمی کۆکردنەوەی سەروەت و سامان بوون و چۆن بەلۆجیکی هێزو بەعەقڵی شمشێر بیریان لەهەموو شت کردۆتەوەو چۆن لەو ساتەوەختەشدا عەلی وەکو پیاوێکی ژیری ئەهلی فیکرو مەعریفەت دەرکەوتووەو لەنێو قەومی نەزانیشدا بەهای ئەوی سەنعەتکار چەند لاواز بووەو ئەوەش مایەی ئازارو ژان بووە بۆی، ئایا لەو چرکەساتەدا عەقڵێك هەبووە گوێی لەعەلی بێت و لەویست و ئاواتەکانی ئەو تێبگات، کاتێ نەزانین باڵی بەسەر کۆمەڵدا کێشاوەو ئەوەی بایەخی پێنەدراوە زانین و فیکر بووە، بەمانایەکی دی دەتوانین ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە هەر لەو مێژووەوە عەلی وەکو هێمای قوربانی دەستی نەزانین دەرکەوتووەو پاشانیش بووەتەوە قوربانی ڕێگای ڕاستی و عەدالەت و زانین، کەسێك دەتوانێت ئەو دەنگی حەقە ببیستێت کە خۆی هەڵگری پەیامی حەق بێت، بێگومان هادی عەلەوی لەڕوانینی پەشێوەوە هەڵگری ئەو پەیامەیە، بۆیە لەلایەك دەیگێڕێتەوە سەردەمی دەرکەوتنی ئیسلام و دەیکاتە چاودێر بەسەر ئەو مێژووەوە کە تاکو ئێستاش مایەی ئاخاوتن لەسەر کردنی زۆرە، لەلایەکی تریشەوە عەلەوی خۆی لەئێستادا هەڵوێستی ڕاستەقینەی خۆی بەرامبەر بەئێمەی قوربانی و برا جەلادەکانی خۆی دەربڕێت و دەبێتە لایەنگری ئێمەی قوربانی و نەفرەت لەوی جەلادی برای دەکات و حاشا لەناسنامەی عەرەبی خۆی دەکات، مادەم ئەوی عەرەب یان باشترین بڵێین ئەوی ناسیۆنالیزمی عەرەبی دەوری جەلاد دەبینێت بەرامبەر بەمنی کوردو دەمکات بەقوربانی. عەلەوی ئەو هەڵوێستەی برا جەلادەکانی ڕەت دەکاتەوە.

شاعیر بەراوردی نێوان قورەیش و هەموو خاسێت و سیفاتەکانیان و ناڵەو نرکەی ئیمامی عەلی بەجێدەهێڵێت و دەگوازێتەوە بۆ سنووری قسەکردن لەچوارچێوەی خێزانی پێغەمبەردا، لەوێشدا دوو لایەن دیاری دەکات لەنێوان هاوسەرەکانی پێغەمبەردا، لایەنی باڵادەست و لایەنی مافخوراو، ئایشەی کچی ئەبوبەکری سدیق و حەفسەی کچی عومەری کوڕی خەتاب لایەنی باڵادەست و ماریەی قیبتی کە کچێکی کۆیلەی میسری بوو، بەدیاری بۆ پێغەمبەریان هێنابوو ڕەمزی قوربانی و مافخوراوی بوو، با لەوە بگەڕێین کە بوونی چەند ژنێك لەیەك کاتدا بەگوێرەی ئەوی ژن چی دەگەیەنێت، بەڵام ئەوەی زیاتر جیاوازی دەردەخات یان بەرهەمدێنێت ئەوەیە لەکاتێکدا ماریەی قیبتی کچێکی کۆیلەی بەدیاری هێنراوە، ئایشەو حەفسە کچی دووان لەهاوەڵە نزیکەکانی پێغەمبەرن کە هەردووکیان لەخەلیفەکانی ڕاشیدین و لەسەردەمی دەرکەوتنی ئیسلامدا بەزوویی بوونەتە موسوڵمان و پاڵپشتی پێغەمبەریان کردووەو ئەوەش سامانێکی مادی و مەعنەوی گەورەی بۆ پێکهێناون کە نەك هەر بوون و ئامادەبوونی بەخۆیان بەخشیوە، بەڵکو بەماڵ و منداڵەکانیشی بەخشیوە، ئەوەش وای کردووە کە ئایشەو حەفسە هەست بکەن ئەمان سەرباری ئەوەی خێزانی پێغەمبەرن، کچی دووان لەهاوەڵە دیارەکانی پێغەمبەریشن، ئەوەش بۆتە هێزێکی بەربڵاو بۆ مومارەسەکردنی دەسەڵاتیان، بەڵام ماریەی قیبتی کچێکی کۆیلەی ڕابووردوو نادیاری بەدیاری هێنراوە وەکو هەر پارچە کاڵایەکی تر، دیارە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئایشەو حەفسەداو ئەم وەکو کاڵا مامەڵەی پێوە دەکرێت و لەئاستی ئەوانیشدا لاوازەو مافی پێشێل دەکرێت، هەروەك ئەو هەراو پەشێوییەی کە ئایشەو حەفسە دەینێنەوە بوار بۆ بیستنی دەنگی لاوازی ماریەی قیبتی ناهێڵێتەوە، دەشێ ئایشەو حەفسە لەپلەی یەکەمدا هاوهەڵوێست بن بەرامبەر بەماریە لەو ڕووەوە کە ئەمان کچی خەلیفە یان کچی هاوەڵی پێغەمبەرن و خۆیان لەئاستێکی بەرزی ئەوتۆدا ببینن کە پێیان ڕەوا نەبێت کۆیلەیەکی بەدیاری هێنراو هاوشانی ئەوان ببێتە هاوسەری پێغەمبەر، هەروەك دەشێ لەلایەکی ترەوە مەبەست لەژاوەژاوی ئایشەو حەفسە ناکۆکی و ئاژاوەی نێوان ئەو دووانە خۆیان بێت کە بەجۆرێك ماڵی پێغەمبەریان پڕ کردبێت لەئاژاوەو ئاڵۆزی تەنانەت خودی پێغەمبەر گوێی لەهاوارو ناڵەی ماریەی قیبتی خێزانی نەبووبێت، هەڵبەت لێرەوە دەردەکەوێت کە عەبدوڵڵا پەشێو لێکچوون لەنێوان کوردو ماریەی قیبتیدا دەکات، هەرچەندە مێژووی ئەم دووانە جیاوازە، بەڵام لەڕووی مافخوران و غەدر لێکردنەوە هاوشێوەن، دیسان هاوشێوەکردنی ئایشەو حەفسە لەگەڵ داگیرکەران و دژەکانی کورددا دەردەکەوێت کە بەمەبەست هەوڵیانداوە پەردە لەسەر ئازارەکانی کورد بنێن و دەنگی کورد کپ بکەن و ڕێگا نادەن دەنگی لەهیچ لایەکەوە ببیسترێت، لەساتێکدا کە کورد کیمیاوی باران دەکرێت و پاکتاوی ڕەگەزی دەکرێت تەنیا کەسێك کە گوێی لەهاوارو ناڵەی کورد بێت و لەئازارەکانی تێبگات هادی عەلەوی-یە، بەڵام ئەو پرسیارە سەر هەڵدەدات ئایا هیچ کەس گوێی لەهاوارو ناڵەی ماریای

قیبتی بووە؟ پەشێو لەئاستی نەگوتراودا هاوشێوە بوون لەنێوان هادی عەلەوی و پێغەمبەردا دروست دەکات، کاتێ دەپرسێ چۆن لەبەر ژاوەی ئایشەو حەفسە گوێت لەسکاڵای ماریەی قیبتی بوو، دیارە عەلەوی تەنیا ئەوەندە پەیوەندی بەمەسەلەی پاکتاوی رەگەزی کوردەوە هەیە کە لەهەمان نەژادی ئەو جەلادانەیە کە ئەو کارەیان ئەنجامداوە، بەڵام پێغەمبەر خۆی و بەویستی خۆی ماریەی قیبتی کە لەبنەڕەتدا قوربانییە، دووبارە دەکاتەوە بەقوربانی، دەشێ بەڕوانینی پێغەمبەر ئەوە چاکە بێت لەگەڵ ماریەدا دەیکات و بەئامانجی رزگارکردنی بێت لەحاڵەتی قوربانی بوون، بەڵام لەڕاستیدا ماریە لەقوربانییەکی کۆیلەوە، دەکرێتە قوربانییەکی زیندانی و لەزیندانی رۆح و جەستەدا پەل بەست دەکرێت.

-٥-

خۆ سەدەکانی ئێمە هەموویان
لکی درەختی چاخی جاهلین
کڵێسەو مزگەوت
شوراو پەرلەمان
بارەگاو دیوان
هەموو بازاڕی گەرمی عوکازن
نابیغەکانیش هەمان نابیغەن
خودایان ورگەو.. نەوەی بەرازن
لەملا بەرزگی شای غەسانییە باوەشێن دەکەن.
لەولا بۆ بن پێی شای مەنازیرە وەک بەردەبازن

عەبدوڵڵا پەشێو رووبەری ئاخاوتن لەم دەقەدا فراوان دەکات و تەنیا لەسنووری ئەوی جەلادی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و منی کوردی قوربانیدا نامێنێتەوە، بەڵکو دەمانگێڕێتەوە بۆ مێژووی رابوردوو، هەروەها سەرجەم عەقڵ و کەلتووری رۆژهەڵاتیش دەهێنێتەوە بەردەم لێدوان و پێی وایە سەرچاوەی دروستبوونی جەلادو قوربانی لەم رووبەرەدا بەرهەمی ئەو عەقڵ و کەلتوورەیە کە ئامادەیەو کاردەکات و هەر کارکردنی ئەو عەقڵ و کەلتوورە داخراوەشە کە وایکردووە لەم رووبەرە فراوانەدا ناسنامەکان تێکەڵاو بن و زۆرجار جیاوازی لەنێوان قوربانی و جەلاددا نەکرێت. پەشێو وای نیشان دەدات کە مێژووی ئێمە واتە مێژووی هەموو رۆژهەڵات یەک ناسنامەی هەیە کە ئەویش لەسەرچاوەکەیەوە بەرهەم هاتووە کە عەقڵ و فیکر کاری تێدا نەکردووە، لەچاخێکەوە سەرچاوەیان گرتووە کە چاخی نەزانینە، بەواتا تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت مێژووی رۆژهەڵات لەوەهەم و جەهالەتی چاخی نەزانینەوە دەستپێدەکات و هەر ئەوەش وایکردووە کە لەم واقیعەدا هەموو شتەکان تێکەڵاوی یەکتر بن و هیچیان تایبەتمەندی خۆیان نەبێت و هیچیشیان ئەرکی راستەقینەی خۆیان جێبەجێ نەکەن، یان رۆڵی خۆیان نەبینن، یان هیچ جدیەتێکیان تێدا نەبێت، بەجۆرێک کڵێسەو مزگەوت، شوراو پەرلەمان، بارەگاو دیوان هەموویان وەکو بازاڕی عوکاز وەسف دەکات، هەموو ئەوە دەزانین کە لەبازاڕی عوکازدا شاعیران شەڕە شیعریان دەکرد یان شیعریان دەخوێندەوە، دیارە ئەرکی هەریەکە لەو دامەزراوانە جیاوازەو هیچ کامیان لەڕاستیدا دەوری ئەویتریان نابینێت، بەڵام لەوەسفکردنەکەی شاعیردا هەموویان بوونەتە شوێنی خوێندنەوەی شیعر، کەواتە هەموویان ناسنامەی خۆیان لەدەستداوە یان هەر لەبنەڕەتدا نەبوون بەخاوەنی ناسنامە، بۆیە هەموویان یەک کار دەکەن، ئەمەش لەڕاستیدا خوێندنەوەیەکی واقیعیانەی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتیدا بەگشتی، کە دامەزراوەکان هەریەکە خۆی بەئەڵتەرناتیڤی هەموو دامەزراوەکانی تر دەزانێت و لەڕاستیدا خۆیشی بەجۆرێک کاردەکات و دەجولێت کە کارەکەی کەمتر پەیوەندی بەو ئەرکەوە هەیە کە دەبێ ئەو دامەزراوە لەڕاستیدا جێبەجێی بکات، ئەمەش لەڕاستیدا پەیوەندی بەوەوە هەیە کە لەکۆمەڵگای رۆژهەڵاتی بەگشتی و لەکۆمەڵگای دواکەوتووی وەکو ئێمەدا عەقڵی دامەزراوەیی دروست نەبووەو عەقڵی باڵاو ئامادە عەقڵی شمولی سەرکردەی ئاینی، سیاسی، خێڵایەتییە کە خۆی بەجێگرەوەی هەموو کۆمەڵگا دەزانێت و لەبری کۆمەڵگا بیردەکاتەوەو بڕیار دەدات، لەکاتێکدا کە عەقڵی تاکەکەس و لێکدانەوەو تێڕامانی نوخبەی بەئاگا هیچ رۆڵێکی نەبێت لەکۆمەڵگادا، ئەوا ئەو عەقڵیەتە باوە شمولییە کاردەکات کە هەموو شتەکان لەبەهاو گەوهەری خۆیان رووت دەکاتەوە، لەکۆمەڵگای رۆژهەڵاتیدا هەروەک عەقڵی دامەزراوەیی دروست نەبووە تایبەتمەندی نەبۆتە خاسیێتێکی باڵادەست لەم رووبەرەداو هەموو ئەو دەزگایانەی هەن وەکویەک کاردەکەن و هاوشێوەش دەکرێن لەگەڵ بازاڕی عوکازدا، هەڵبەت لەبازاڕی عوکازدا شیعر دەخوێندرایەوە، دیارە بەهای شیعر پەیوەست بەو دامەزراوانەو عەقڵی دامەزراوەیی گرنگیەکی ئەوتۆی نییە، بەتایبەتیش ئەو شیعرەی کە لەوێدا خوێندراوەتەوە رێگای تێناچێت شیعری جدی بوو بێت.

پەشێو وای نیشان دەدات سەرجەم دامەزراوەکانی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی بەدامەزراوەی ئایینی و بەدامەزراوەی عەلمانی و بەڕێوەبردنەوە هەموویان یەک شووناسیان هەیە کە ئەویش لەبنەڕەتدا شووناسی راستەقینەی خۆیان نییە، بەڵکو هەموویان جۆرێکن لەبازاڕی عوکاز، بازاڕی عوکازیش لەخۆیدا شووناسێکی هێندە پڕ بایەخی نییە، چونکە شوێنی خوێندنەوەی شیعر بووە، پاشاو دەسەڵاتدارانی تیا مەدح کراوەو جێگای شەڕە شیعر بووە لەپێناوی بەزاندنی یەکتردا نەک لەپێناوی بیناکردن و تەواو کردنی یەکتردا، بەهەمان شێوە مزگەوت و کڵێسەو شوراو پەرلەمان و بارەگاو دیوان کە ئەمانە شوێنی تەقسە ئایینیەکان و گفتوگۆ و بڕیاردان و جێگای حزب و دەوڵەتیشن هەمان عەقڵییەتی بازاڕی عوکاز بەڕێوەیان دەبات و جێگای شەڕە قسەن لەپێناوی بەزاندنی یەکتردا، ئەمەش ئەو دەلالەتە هەڵدەگرێت کە هیچکام لەم دەزگایانەی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی عەقڵی

یەکتر خوێندنەوەو یەکتر قبوڵکردن بەڕێوەیان نابات و هیچ کامیشیان کارو ڕووداو دروستکردن تیایاندا نەبۆتە بنەماو پێوانە بۆ هەڵسەنگاندن چ هەڵسەنگاندنی ئەندامانی نێو دامەزراوەکان خۆیان بێت چ هەڵسەنگاندنی کۆمەڵگاو خەڵکی دەرەوەی دامەزراوەکان بێت، بەڵکو لەهەمووان زۆر بڵی ترو زمان درێژتر زیاترین دەسەڵاتی دەبێت لەو دەزگایانەدا، لەبنەڕەتیشەوە ئەم دامەزراوانە عەقڵ ئیشیان تێدا ناکات، بەڵکو بەسۆزو خەیاڵ و هەڵچوونی شیعری دەڕۆن بەڕێوە لەپشتی ئەم ڕوانینەوە ئەو دەلالەتە بەرهەمدێت کە لەدامەزراوەکانی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتیدا لەبری عەقڵ و فیکرو لێکدانەوە، خەیاڵ و سۆزو هەڵچوونی شاعیرانە کاردەکات و هەر بەو پێیەش لەم کۆمەڵگایەدا لەبری ئەوەی عەقڵ کۆمەڵ ببات بەڕێوە، خەیاڵ و هەڵچوون دەیبات بەڕێوە، هەر ئەوەش هۆکاری سەرەکییە بۆ ئەوەی لەبەردەم ئەوی ڕۆژئاوادا وەکو پەراوێز دەربکەوێت و هەمیشە پاشکۆ بێت بۆ عەقڵی ڕۆژئاوا. لەزەمینەیەکی لەمجۆرەدا تاکەکەس بەئاسانی دروست نابێت، هەر بۆیە توانای دان پێدانان و قبوڵکردنی ئەوی دی نایەتە ئاراوەو هەرکەس پەیوەستە بەنەتەوەو ئیتنیك و دامەزراوە ئایینی و حزبی و خێڵایەتییەکەی خۆیەوە، ئەو دامەزراوە نەتەوەیی و ئیتنیکی و ئایینی و خێڵایەتییە بەهەر شێوەیەك بێت گرنگ نییە، بەڵکو ئەم بەرگری لەئینتیمای خۆی دەکات با دامەزراوەکەی ئەو هێمای دیارترین و دڕندەترین جەلادیش بێت، ئەمەش هۆکاری سەرەکییە بۆ ئەوەی مرۆڤی تەواو لەڕۆژهەڵاتدا بەئاسانی دروست نەبێت، هادی عەلەوی کە نموونەی مرۆڤی تەواوە لەم زەمینە ناجۆرەدا دروست بووە، دیارە ئەوەش بارێکی تایبەتییەو دەکەوێتە دەرەوەی ئەو یاسایانەی ئەم کۆمەڵگایە بەڕێوە دەبەن.

پەشێو لەکاتێکدا هەموو دامەزراوەکانی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی دەشوبهێنێت بەبازاڕی عوکان، هەموو پاڵەوانەکانی ناو ئەو دامەزراوانەش دەکاتە هاوشێوەی نابیغەی زوبیانی کە نموونەی شاعیری بێ هەڵوێست بووەو ڕۆژێ بەشای غەساسینەدا هەڵیداوەو ڕۆژێکی تریش بەشای مەنازیرەدا، مەبەست لەم هاوشێوە کردنەش ئەوەیە کە دامەزراوەکانی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی هەروەك خۆیان خاوەنی شووناس نین، هەروەها بکەرەکانیشیان خاوەنی شووناسی تایبەتی خۆیان نین، بەڵکو هەموویان یەك شێوەن کە ئەوانیش ئەرکیان پیاهەڵدان و وەسفکردنی دەسەڵاتدارانە، ئەمەش واقیعی ڕاستەقینەی ڕۆژهەڵات نیشان دەدات کە زەمینەیەکە تیایدا تەنیا کەسی یەکەم خاوەنی دەسەڵات و بڕیارەو هەرچی دامەزراوو کۆمەڵگاش لەگەڵیدا لەژێر سایەی بڕیاری ئەودان و ئەو دەیانبات بەڕێوەو هەر ئەویش لەبری هەمووان بیردەکاتەوەو بڕیار دەدات و هەمووانیش پاساوی بۆ دەهێننەوەو تەنانەت ڕەوایەتی دەدەن بەکارە هەڵەو نابەجێکانی و دەیگەیەننە ئاستێك کە دەبێتە وێنەی خودا لەسەر زەوی، هەموو سەدەکانی ئێمە لەڕۆژهەڵاتدا لەمێژووی زانراو یان تۆمارکراودا بەمشێوەیە بوون، ڕەگ و ریشەی ئەم ڕوانینەش کە کۆنترۆڵی ژیانی سیاسی و کەلتووری و عەقڵی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی کردووە لەو سەرچاوە مێژووییەوە هاتووە کە نەزانین و وەهم و غەیانییەت دەسەڵاتی بەسەرداکردووەو ڕووبەری کارکردنی عەقڵ و بیرکردنەوەو تێڕامان تیایدا زۆر تەسك بۆتەوە بەجۆرێك کە نەیتوانیووە لەبەرامبەر سەرچاوەکانی نەزانیندا قوورسی هەبێت، مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی لەزەمینەیەکی لەمجۆرەدا پەروەردە بووەو تاکو ئێستاش کۆنەستی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی لەیادەوەرییەکانی ئەو ڕابوردووە کۆنترۆڵ کراوە، کە کۆنەستێکی ڕکێف کراوی چەپێندراوە، ڕاستە ئەو حاڵەتی چەپاندنە ڕۆژێ لەڕۆژان دەوروژێ و دەشێ گۆڕانکاری دیار بهێنێتە ئاراوە، بەڵام تاکو ئێستا لەبارێکی پاسیڤ کراودایەو ئەوەش وایکردووە مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی مرۆڤێکی کەسێتی لاوازو تێکشکاو بێت و ئەوەش وای لێ بکات هەمیشە گوێڕایەڵی فەرمان و بڕیارەکانی کەسی یەکەم بێت و هەر ئەوەش وایکردووە کە زەمینەی ڕۆژهەڵات زەمینەیەکی لەباربێت بۆ دروستکردنی تاکەکەسی دیکتاتۆر یان عەقڵی داخراوی سەرکوتکەری داپڵۆسێنەر کە جگە لەخۆی کەسی تر نابینێت، ئەمەش هەر لەسنووری پەیوەندی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی و فەرمانڕەواو دەسەڵاتی سیاسیدا نەماونەتەوە، بەڵکو کەسێتییەکی دروستکردووە کە هەمیشە گوێڕایەڵی ئەوی فەرمانڕەوا بێت و بەپێی فەرمانی ئەو بجوڵێت و خۆیشی کەسێتی بێ گەوهەرو بێ ماهیەت بێت، کەسی بێ گەوهەرو بێ ماهیەت و تێکشکاو ناتوانێت دان بەتاوانەکانی خۆیدا بنێت، چونکە ئەو جۆرە کەسێتیە کەسێتی تێکشکاوەو کەسێتی تێکشکاویش هەمیشە خۆی دەخاتە چوارچێوەی دەستە یان کۆمەڵەوە بۆ ئەوەی بەلایەنی کەمەوە لەڕووی دەروونییەوە خۆی بپارێزێت.

کاتێ گەلی کورد کیمیاباران دەکرێت و ئەنفال دەکرێت و پرۆسەی پاکتاوی ڕەگەزی بەرامبەری ئەنجام دەدرێت ئەو کەسەی لەنەتەوەی سەردەست و هاونەژادی ئەوی جەلاددایە ناتوانێت سەیری جەستەی کوردی بکات و ئازارەکانی ببینێت، چونکە تەنیا کەسی تەواوە دەتوانێت ئەوانی دی ببینێت و لەگەڵیان بدوێ و دان بەبوونیاندا بنێت، کاتێ ئەوی هاونەژادی جەلاد دان بەئازارەکانی کوردو بەبوونیشیدا نانێت، لەبەرئەوەیە ئەو هەست بەبوونی خۆی ناکات، هادی عەلەوی لەو واقیعە قەیراناوییەدا ئەو تاکە کەسەیە کە گەیشتۆتە ئاستی مرۆڤی تەواو کە دان بەهەموو شتەکاندا دەنێت، چونکە دەتوانێت بیانبینێت و لەڕاستیدا پێش بینینی ئازارەکانی ئەوی دی خۆی دەبینێ لەو واقیعەدا کە سەرجەم دامەزراوەکانی

کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی نەبوونەتە خاوەنی شووناسی تایبەتی خۆیان، ئەو عەقڵەی کە ئەو دامەزراوانەش دەبات بەرێوە نەبۆتە عەقڵێکی خاوەن ناسنامەی ئەوتۆ کە خاوەنی بوونی خۆی بێت و لەبەرامبەر شتەکاندا هەڵوێستی دیاری خۆی هەبێت و لەسەر روانینی خۆی سەوداگەری نەکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە کەسەکان لەم دامەزراوانەدا هاوشێوە دەکرێن لەگەڵ شاعیرێکی بێ هەڵوێستی وەکو نابیغەی زوبیانی دا کە هەمیشە لەهەڵوێستی پێداهەڵدانی شای غەساسینەو شای مەنازیرەدا بووە، ئەم دووانەش ناکۆک بوون، لێرەدا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات کە چۆن دەشێت لەیەک کاتدا دۆستی دوو نەیار بێت، لێرەدا مەبەستی شاعیر ئەوە نییە کە مرۆڤ تەنیا رەش و سپی ببینێت و یان لایەنگر بێت یان دژ، نەخێر، مەبەست ئەوەیە کە ناکرێت لەیەک کاتدا مەدحی جەلاد بکەیت و فرمێسکیش بۆ قوربانی بڕێژیت.

لەعەقڵیەتی باوی رۆژهەڵاتدا بەگشتی و عەقلیەتی ناسیۆنالیزمی عەرەبیدا کە خاسیەتی جەلادی هەبووە بەرامبەر بەمنی کورد، کەچی ئەندامانی ئەو دەزگایانەی کۆمەڵگای عەرەبی و بەگشتی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و بەتایبەتیش رۆشنبیری عەرەبی بێجگە لەنوخبەیەکی زۆر کەمی وەکو هادی عەلەوی و ئەوانی دی دەوری نابیغەیان بینیووە، هەروەک چۆن نابیغە هەردەم لەدیوانی شادا بووەو گەلی نەبینیووە، با شاکان ناکۆکیش بووبن، هێشتا بۆ نابیغە ئاسان بوو کە لەخزمەتی ئەواندا بژی، چونکە ئەو شایانە لەماهیەتدا یەک بوون، واتە لەرووی دەسەڵاتەوە، بەواتا نابیغە نوێنەری شاعیر یان مرۆڤی بستە باڵای نێو دیوانی شایە کە هەمیشە دەیەوێت مەدحی دەسەڵات بکات، بەلام (گەل) کە لەدەرەوەی دەسەڵاتەو بەجۆرێك لەجۆرەکان قوربانییە، نابیغەکان چاویان قوربانی نابینێت، دیارە لەهاوشێوەکردنی (کورد)یش قوربانییە بۆ هاوشێوەکانی نابیغە کە لەناسیۆنالیست و رۆشنبیری نەتەوەکەی عەلەوی ناتوانن دانی پێدا بنێن.

-٦-

لەرۆژهەڵاتی رۆژ لەبن پێدا،
لەرۆژهەڵاتی
دەستنوێژ هەڵگرتن بەخوێن و پیترۆڵ.......
چۆن توانیت گەورەم
بێدەنگی ڤانگ دەی
تۆ چۆن زاتت کرد
ئەو کولەکەیە بدەی بەعەرداو
پڕ بەدەنگ، بانگ دەی

پەشێو جارێکی دی و بەئاراستەیەکی قووڵتر دەکەوێتە ئاخاوتن لەسەر رۆژهەڵات، لەبارێکی ئەگوتراودا دووانەیەك دروست دەکات لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا، هەرچەند هیچ لەبارەی رۆژئاواوە نادرکێنێ، بەلام وەسفکردنی رۆژهەڵات لەرێگای ئەو خاسێتانەوە کە هەیەتی شووناسی رۆژهەڵات لەوی رۆژئاوا جیادەکاتەوەو هەڵوێستی ئەوی شاعیریش دەردەکەوێت کە لایەنگری ئەوێی رۆژئاوایەو ناکۆکە لەگەڵ ئێرەی رۆژهەڵاتدا، ئەو رۆژهەڵاتەی کە زەمینەی نەزانین و شاردنەوەو درۆو پیاهەڵدان و مەرگی تاکەکەس و قەیرانی عەقڵە، ئەگەر (رۆژ) هێمای زیندەگانی و روناکی و ژیان بێت، ئەوا لەم زەمینەدا کە ناوی رۆژهەڵاتە (رۆژ) لەنزمترین ئاستدا دانراوەو هیچ بەهایەکی نییە، واتە ئەو ناوەی بەم زەمینە بەخشراوە لەجێگای خۆیدا نییەو مادەم جێگای ئەم هەموو ناجۆری و بارە نائاساییانەیە دەبوو رۆژ لێرەوە هەڵنەیەت.

لەم رۆژهەڵاتەدا کە زەمینەی تاکە عەقڵ و تاکە بیرکردنەوەو تاکە روانین و تاکە ئایین و تاکە حزب و تاکە سەرکردەیە، هەموو ئەو تاکانە لەپێناوی پارێزگاریکردن لەبوون و مانەوەی خۆیدا بۆ هەتاهەتا هەموو ئەوانی دی لەناو دەبەن و دەسڕنەوە، لەم رۆژهەڵاتەدا کە باسی بەها پیرۆزەکان دەکرێت و بەحیساب خەبات دەکرێت لەپێناوی ئەو بەهایانەدا، کەچی هیچ حیسابێك بۆ مرۆڤ ناکرێت کە گەورەترین سەرمایەیە لەم گەردوونەدا، بەڵکو خوێنی مرۆڤ بەهایەکی ئەوتۆی نییەو بەئەندازەیەك خوێنڕشتن کارێکی سانایە کە شاعیر باسی ئەوە دەکات دەستنوێژ بەخوێن بگیرێت، ئەمەش لەلایەك بەسووك سەیرکردنی مرۆڤ نیشان دەدات، لەلایەکی ترەوە بەها ئایینیەکان دەخاتە بەردەم گوومانەوە، لەکاتێکدا کە نوێژ وەکو یەکێك لەپایە سەرەکییەکانی ئایین سەیر دەکرێت و بڕواداران بۆ نیشاندانی دڵسۆزی و بڕوابوونی خۆیان بەخوداو بەئایینەکەی ئەنجامی دەدەن، کەچی دەستنوێژەکەیان بەخوێن هەڵدەگرن، واتە هەرچەند خۆیان بەبڕوادارو خواپەرست دەزانن، کەچی لەخوێنڕشتن بێباکن و دەشێ لەپشتی ئەم لێکدانەوەیەوە ئەو دەلالەتەش بەرهەم بێت کە ئەوانەی خوێن دەرێژن و خۆشیان بەبڕوادار دەزانن و رەوایەتیش دەدەن بەرشتنی ئەو خوێنە، بەحیسابی خۆیان لەپێناوی ئاییندا، دەیانەوێت بەو بیانووەوە پارێزگاری لەبوونی دەسەڵاتی خۆیان بکەن، بەلام لەهەمان کاتدا ئەو دەلالەتەش بەرهەم دێت کە بەرشتنی خوێن کە بەرهەمی ئەنجامدانی تاوانە، چونکە بەهیچ بیانوویەك رژاندنی خوێن رەوا نییە، ئەرکی ئایینی جێبەجێ دەکرێت، بەمانایەکی دی ئەو خوێنەی دەرژێت لەپێناوی پیرۆزی ئاییندایە، دیارە ئەمەش روانینی ئەوی شاعیرە بۆ رۆژهەڵات و بۆ عەقڵی باوو بالادەستی رۆژهەڵات کە ئایینی کردۆتە پاڵپشت بۆ هەموو کارێکی نامرۆڤانە، هەرچەندە ئەوە ئاشکرایە گەوهەرو ماهیەتی ئایین لەو روانینە دوورو بێبەرییە. هەڵبەت لەرۆژهەڵات لەپاڵ خوێندا توخمی دووەمیش دێتە ئاراوە کە ئەویش (پیترۆڵ)ـە، ئەوە ئاشکرایە هەتا چارەکی یەکەمی سەدەی بیست رۆژهەڵاتییەکان هیچیان لەبارەی پیترۆڵەوە نەدەزانی، کاتێ رۆژئاواییەکان هاتنە ئەم کیشوەرە نەوتیان دەرهێنا بەوەش نەوت بووە هاوشانی خوێن لەرۆژهەڵاتدا،

چونکه بووه گرنگترین سەرچاوەی ژیان و ئەو ولآتانەی کە ئابووری نەوتیان هەیە لەو ساتەوە بۆ ئێستا بوونەتە مشەخۆرو لەسەر ئابووری نەوت دەژین، بێئەوەی لەبوارەکانی تردا شتێکی ئەوتۆ بەرهەمبهێنن، ئەم حاڵەتی مشەخۆرییە وایکردووە کە مرۆڤی رۆژهەڵاتی توانای بیرکردنەوەی نەمێنێت، دیارە رۆژئاواش کە هاتنە ناوچەکە عەقڵی دەرهێنان و کارپێکردن و چۆنێتی خەرجکردنی بەرهەمەکانی پیترۆڵیان فێری خەڵکی نەکرد، بەڵکو پیترۆڵی ئامادەیان خستە بەردەستیان و پارەیان لەو ڕێگایەوە دەستکەوت، بەڵام نەبوونە خاوەنی ئەو عەقڵەی کە پیترۆڵ دەردەهێنێ و خاوێنی دەکاتەوە.

پیترۆڵ بوو بەسەرچاوەیەکی بەهادارو وەکو هاوتایەکی نوێژ یان پەرستیاری دەرکەوت یان بووە هاوشێوەی خوێن بەواتا هەرچۆن خەڵکی بڕوادار بەخوێن دەستنوێژیان هەڵدەگرت، بەهەمان شێوەو بۆ هەمان مەبەست پیترۆڵیش بەکاردێت، بەواتا پیترۆڵیش رەگەزێکی بەهادارەو لەڕۆژهەڵاتدا کە خوێن بەهای نییە، پیترۆڵیش وەکو خوێن بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن بەکاردێت، لەلایەکی ترەوە بەکارهێنانی پیترۆڵ تەمەڵی و بێ بەرهەمی و مشەخۆری کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی نیشان دەدات، لەهەمان کاتدا هەرچەندە پیترۆڵ بەهایەکی زۆری هەیە لەژیانی ئابووری جیهاندا، بەڵام لای کۆمەڵگا رۆژهەڵاتییەکان کە نەوت سەرچاوەی داراییانەو بەباشی بەهای ئەو سەرچاوە گرنگە نازانن و بەئارەزووی خۆیان نەك بۆ ژیان و ئاوەدانکردنەوەو بەختەوەری، بەڵکو بۆ کوشتن و بڕین و وێرانکردن و سەرکوتکردنی گەلەکانی خۆیان و بۆ دەوروبەریش بەکاردەهێنن، لێرەدا دەردەکەوێت کە لەڕۆژهەڵاتدا خوێن کە مەبەست سەرچاوەی مرۆییە و نەوتیش کە سەرچاوەی ئابوورییە هەردووکیان لەڕوانینی دەسەڵاتی تاکەکەس و تاکە عەقڵی و تاکە ئایین و تاکە حزب و تاکە ڕوانینەوە.. هیچ بەهایەکی ئەوتۆیان نییەو هەردووکیشیان دەکرێنە قوربانی لەڕێگای پاراستنی دەسەڵاتی تاکەکەس و تاکە عەقڵ و تاکە ڕوانیندا کە ئەویش کوشتنی کەسێتی مرۆڤی رۆژهەڵاتییە بەجۆرێکی ئەوتۆ کە توانای دەربڕینی خۆی نەبێت و نەتوانێت هەڵوێست بەرامبەر بەشتەکان دەرببڕێت و ملکەچی بڕیارو بەرنامەکانی تاکە کەسی دەسەڵاتدار بێت، هادی عەلەوی ئەو تاکە کەسەیە کە کەلتووری خوێن وکەلتووری نەوت نەیانتوانیووە عەقڵ و بوون و کەسێتی بکوژن، بۆیە دەتوانێت لەسەردەمی قەیرانی مرۆڤی خاوەن بڕیاردا لەڕووبەری رۆژهەڵاتدا ئەو وەکو مرۆڤی ئازاد بڕیار بدات، لەپشتی هاوشێوەکردنی کەلتووری خوێن و کەلتووری پیترۆڵەوە دەلالەتی بوونی عەقڵیەتێکی داخراوو مەرگدۆست و وێرانکەر بەرهەمدێت کە جگە لەکەسی دەسەڵاتدارو عەقڵی تاك رەهەندی داخراوو کەلتووری بەپیرۆز سەیرکەری ئەو دەسەڵاتە، هیچی تر نابینێت، پەشێو لەم دەقەدا کەلتوورو عەقڵی داخراوی رۆژهەڵاتی دەخاتە بەردەم بەرپرسیارێتییەوە، بەرپرسیارێتی هێشتنەوەی کۆمەڵگا لەدەرەوەی ماف و لەدەرەوەی ئازادی.

ئەم رۆژهەڵاتەی کە کەلتووری خوێن و کەلتووری پیترۆڵ بەرێوەی دەبەن کە یەکەمیان پەیوەستە بەسەرەتایی بوونی کۆمەڵگاو غەریزەی ئاژەڵیی ناو سروشتەوە کە بەهێز بێ هێز دەخوات و دووەمیشان پەیوەستە بەعەقڵی سەردەم و تەکنۆلۆژیاوە، بەڵان بەگوێرەی رۆژهەڵات ئەو عەقڵە لەجوگرافیای خۆیدا بەرهەم نەهاتووە، بەڵکو لەوێی رۆژئاواوە قەرز کراوە، بۆیە بەشێوەیەکی ناسروشتی کاردەکات، رۆژهەڵات لەنێو پێکدادانی ئەم دوو کلتوورەدا ماوەتەوە کە هەریەکەیان بەئاڕاستەیەك رۆحی مرۆڤی رۆژهەڵاتی و بوون و ئازادیان کوشتووەو وایان لێکردووە ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو دەسەڵاتە بێت کە عەقڵ و کلتووری خوێن و کلتووری پیترۆڵ بەرهەمیان هێناوە. لەڕۆژهەڵاتدا کلتووری خوێن هێمای عەقڵی سەرەتایی و خێڵایەتی ئەم کۆمەڵگایە هەڵدەگرێت کە ئەویش گەوهەرەکەی ستراتیژی خێڵە واتە پاراستنی عەقڵ و دەسەڵات و بوونی مادی و مەعنەوی خێڵ کە بۆ قۆناغەکانی دواترو بۆ ئێستاش ئەو عەقڵیەتە ئامادەیەو کاردەکات، لەهەمان کاتدا عەقڵی پیترۆڵ و کلتووری پیترۆڵ لەڕۆژهەڵاتدا هێمای گواستنەوەی کاریگەرییەکانی تەکنۆلۆژیای رۆژئاوایە کە بەگوێرەی رۆژهەڵات دروستکردنی دوڵەتی نەتەوەییە لەدەرەوەی بوون و ئامادەبوونی نەتەوە یان بەزمانی هاوچەرخ لەدەرەوەی پێگەیشتنی ناسیۆنالیزم، واتە ئەو جۆرە دەوڵەتە لەدەرەوەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی دروستبووە ئەویش بەهۆکاری ئابووری کەڵەکەبووی پیترۆڵ، بەواتا دروستبوونی جۆرێك لەدەسەڵات بەبێ رەخساندنی زەمینەی مەوزوعی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی کە ئەوەش وایکردووە ئەو دەسەڵاتە کە بکەرەکەی یان بەرهێنەرەکەی ئەوی خێڵی هەڵگری کلتووری داخراوی خێڵایەتی و دروست بووە لەسەر بنەمای خوێن و دەمارگیری لەگەڵ ئابووری کەڵك بووی پیترۆڵدا یەکبگرێتەوەو لەپێناوی پاراستنی خۆیدا هەموو ڕێگاکانی ئازادی دابخات و رووبەری پیادەکردنی ئازادی و ماف تەواو تەسك بکاتەوە لەپێناوی سەپاندنی خۆی و پاراستنیدا، لەبارێکی ئەتۆو لەفەزایەکی لەمجۆرەدا دروستبوونی زەمینەی لەبار بۆ رەخساندنی تاکی خاوەن شووناس لەقەیراندا دەبێت، کاتێکیش تاکی خاوەن شووناس دروست نەبێت قسەکردن لەسەر رەتکردنەوەی حاڵەتی باوو کلتووری ئامادە مایەی گوومانە، لەزەمینەی رۆژهەڵاتدا، لەو زەمینەیەدا کە بەرهەمهێنانی ئەم دەقە پەیوەستە پێیەوە، تاکی خاوەن شووناس و بەو پێیەش نوخبەی خاوەن شووناس و خاوەن بڕیار دروست نەبووەو ئەوەشی کە پێی دەڵێن جەماوەر لەو ئاستەدا نییە کە لەگەوهەرو ماهییەتی

شتەکان تێبگات و بتوانێت هەڵوێستیان بەرامبەر نیشان بدات، بەڵکو بەپێچەوانەوە جەماوەر لەدوو ئاستدا دەبێت بەقوربانی، ئاستی یەکەمیان ئەوەیە کە تاکی دەسەڵاتدار یان عەقڵی داخراوی تاک رەهەند، لەپێناوی پاراستنی خۆیدا بوون و ئازادییان دەکوژێت، لەئاستی دووەمیشدا ئەوی دەسەڵات بەشێکی زۆر لەجەماوەر دەکاتە ئامرازی سەرکوتکردنی بەشەکەی دی کە لەمبارەشدا ئەوی جەماوەری بەئامرازکراو بۆ سەرکوتاندنەوە دیسان قوربانیە، هەمان شێوەی بەشەکەی دی کە قوربانی سەربڕراوە، ئەم بەشەیش قوربانی بەزۆر کراو بەجەلادە، لەسنووری ئەم دەقەی پەشێودا نەتەوەکەی پەشێوە قوربانی سەبڕراوە، نەتەوەکەی هادی عەلەوی-ش جەلادی قوربانییە، چونکە بەزۆرو لەدەرەوەی ویستی خۆی تاکی دەسەڵاتدارو عەقڵی داخراوی تاک رەهەندی ناسیۆنالیزمی نەتەوەکەی کە عەقڵی ناسیۆنالیزمی عەرەبییە کردویەتی بەجەلادی منی کوردی قوربانی. پەشێو پەردە لەڕووی عەقڵ و کلتوورو ئەخلاقی رۆژهەڵات هەڵدەداتەوەو بەجۆرێك لەجۆرەکان موزەیەفی هەموو ئەو شتانە نیشان دەدات کە عەقڵی رۆژهەڵاتی شانازیان پێوە دەکات و بەپیرۆز سەیریان دەکات و پێی سەیرە کە لەو واقیعە موزەیفەدا کەسێکی خاوەن شوناسی وەکو هادی عەلەوی دروست بێت و پڕکێشی ئەوە بکات هەموو ئەو پێوانانەی کە لەسەر بنەمای درۆ پیرۆز کراون رەت بکاتەوە.

-٧-

لەڕۆژهەڵاتی/ مارە بەجاش و/ رشك و ئەسپێدا/ ئەو رۆژهەڵاتەی/ نامووس فیرارەو/ پەنابەرێکە لەناو دەرپێدا/ سەرم سوڕماوە/ چۆن توانیت گەورەم/ بێدەنگی قانگ دەی؟/ تۆ چۆن زاتت کرد/ ئەو کولەکەیە بدەی بەعەرداو/ پڕ بەدەنگ بانگ دەی

لەڕۆژهەڵاتێکدا کە تەنانەت دروستکردنی خێزانیش بنەمایەکی زۆرەملێی هەیەو تەنانەت ئەگەر بەرێککەوتیش یان لەئەنجامی هەڵچووندا پیاو کە هێمای دەسەڵاتە ئەگەر ژنەکەی تەلاقدا، ئەوا بەفێڵێکی پڕ لەدرۆ کە هەندێ لەپیاوانی ئایین دەیکەن، جارێکی دی ژنە بەگێڕنەوە بۆ لای مێردەکەی دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لەپیاوێکی تری مارە دەکەن، ئەم کارە لەڕووکەشدا گرنگییەکی ئەوتۆی نییە، بەڵام خاسیەتی ئەو عەقڵییەتە دەردەخات کە لەپشتی رێگادان و پەسەندکردنی کارێکی لەمجۆرەدا کار دەکات، دەشێ ئەم روانینە بگوازرێتەوە بۆ پانتایی سیاسەت و بەگوێرەی کوردیش قسەی لەسەر بکرێت، نەك بۆ ساتەوەختی بەرهەمهێنانی دەقەکە، بەڵکو بۆ ئێستاش. کورد لەم بەشەی کوردستاندا ماوەی دووروودرێژ شۆڕشی کردووە، دیارە لەناوەڕۆکدا شۆڕش لەپێناوی سەربەخۆیی و بەدەستهێنانی مافەکاندا بووە، زۆربەی کات بزووتنەوەی کوردی لەڕێگای گفتوگۆوە لەڕژێم نزیکبووەتەوەو بەجۆرێك لەجۆرەکان هەوڵی ئاشتبوونەوەی لەگەڵ داوە، دوا خاڵی ئەم سیناریۆیەش ئەوەیە کە دوای دوانزە ساڵی سەربەخۆیی کوردستان، لەشێوەی مارە بەجاشدا جارێکی دی ئەم بەشەی کوردستان لکێندرایەوە بەعیراقی عەرەبییەوە، بەبێ ئەوەی هیچ زەمانەتێکی ئەوتۆ هەبێت کە ئەوی عەرەب واتە ئەوی مێرد بەهەمان شێوەی پێشتری رەفتار نەکاتەوە، کەواتە لێرەدا ئەو دەلالەتە بەرهەم دێت کە لەزەمینەیەکدا عەقڵ کۆنترۆڵی کۆمەڵگای نەکردبێت و تاکو ئێستا لەپەراوێزو پاشکۆدا بژی و تاکو ئێستا پەردەی درۆو نەزانین و فریودان لەبری راستی و سەراحەت و زانین و هەڵسەنگاندن و لێکدانەوە کۆنترۆڵی کۆمەڵگای کردبێت، ئەوا بکەری ئەو کۆمەڵگایە ئەو بکەرەیە کە وەکو ئەوی ئافرەت مارە بەجاشی بەسەردا دەسەپێندرێت. پەشێو مەسەلەی چەمکی نامووس یان شەرەف دێنێتە ئاراوەو ئەویش وەکو خاسیەتێکی کۆمەڵگا دواکەوتووە رۆژهەڵاتیەکان نیشان دەدات و سنوورو چوارچێوەی ئەو چەمکەش لەم کۆمەڵگایانەدا دیاری دەکات کە تەنیا بریتییە لەمەسەلەی (سێکس) بەمانایەکی دی چەمکی نامووس لەعەقڵی رۆژهەڵاتیدا بەندە بەسێکسەوە، ئەویش گرنگ ئەوەیە بەئاشکرا نەکرێت، ئەگینا بەدەیان شێواز پەردەپۆش دەکرێت، ئەمەش ئەو مانایە هەڵدەگرێت کە مەسەلەی (نامووس)یش لەرۆژهەڵات جۆرێکە لەو درۆیەی لەڕووکەشدا کراوەتە کۆتێك بۆ سەرکوتکردنی کۆمەڵ بەناوی ئەخلاقەوە لەکاتێکدا زۆر لایەنی تری ژیان و جووڵەی مرۆڤ و کۆمەڵگا هەیە کە دەبێت لەسەرووی سێکسەوە دابنرێت و وەکو چەمکی ئەخلاق لێی بڕوانێت و پێوانە بکرێت، بەڵام هەموو ئەوانە دەخرێنە دەرەوەی چەمکی ئەخلاقەوەو تەنیا مەسەلەی سێکسی دەکرێتە خاڵی سەرەکی و ئەخلاقی کۆمەڵایەتی پێدەپێورێت، لەکۆمەڵگا رۆژهەڵاتی و نەریتییەکاندا کوشتنی مرۆڤ سادەترین بنەمای ئازادی و دیموکراسی و فرۆشتنی سەروەری نیشتیمانی و نەتەوەیی.. هیچیان بەرووخاندنی ئەخلاق دانانرێن، بەڵام مەسەلەی سێکس دەکرێتە پێوانە بۆ ئەخلاق، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو رووبەرو پنت و جومگە کۆمەڵایەتییەکان و ژیانی کۆمەڵایەتیش لەمەسەلەی ئەخلاق رووتکراوەتەوەو هەموو سەنگ و قوورسی ئەخلاق دراوە بەسێکس، ئەمەش خاسیەتی کۆمەڵگایەکی ناسروشتییە کاتێك دیاردەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لەباری سروشتی خۆیان دەچنە دەرەوە، هەڵبەت لەکاتێکدا لەکۆمەڵگای رۆژهەڵاتیدا زەمینەی بنیادنانی دیموکراسی و ئازادی و ماف لەئارادا نەبێت، مانای وایە هیچ پێوانەیەکی بابەتیش بۆ هەڵسەنگاندن و دیاریکردنی بەهای شتەکانیش بەئەخلاقیشەوە لەئارادا نییە، لەم کۆمەڵگایەدا کە پانتاییە پەیوەستەکان بەژیانی ئازادی و دیموکراسی و ماف لەبەر تەسکی یان لەبنەڕەتدا نەبوونیان، ئابنە شوێنی لێدوان، ئاخاوتن

لەسەر ئەخلاق واتە شەرەفی کۆمەڵایەتی کە خۆی لەسێکسدا کۆدەکاتەوە دەبێتە جێگای لێدوان و بگرە دەبێتە پێوانەی دیاریکردنی ئاستی ئەخلاقی کۆمەڵایەتیش. لەم واقیعەدا کەسی خاوەن شووناس یان تاکەکەسی ئامادە دەتوانێت پەردە لەڕووی راستی لابدات و حەقیقەتی شتەکان وەکو خۆی نیشان بدات، بێ ترس لەوەی دەرئەنجامی ئەو نیشاندانە یان ئەو دانپێدانانە چۆن و چی دەبێت. لەم واقیعەدا کە قسەکردن بەئاڕاستەی پەردە لادان لەڕووی راستی شتەکان بەرهەمی عەقڵێکی پڕکێشیکەری خاوەن شووناسە، دیسان ئەوەش دەخاتەڕوو کە لەپشتی ئەو روانینەوە سەرەتای فۆرمەلەبوونی عەقڵی رەخنەگرتن یان عەقڵی رەخنەیی دەردەکەوێت کە عەقڵێکە لەنێوان خۆیی و عەقڵی گشتی ملکەچ بۆ دەسەڵاتی تاکەکەس و تاکە کلتوورو تاکە روانین و تاکە هەڵوێستدا سنوور دادەنێت و خاسێتی بێدەنگی بەردەوام هەڵدەوەشێنێتەوەو قۆناغی دواندن دەستپێدەکات، دواندن بەو مانایەی کە گوتن بگاتە ئەو ئاستەی کە ئەوی گوێگر بیبیستێت، لەسەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامدا بەپێی بۆچوونە مێژووییەکان بانگ بەئاشکرا نەدراوەو گوایە لەکولەکەدا بانگدراوە، بەڵام دواتر ئەو سنوورە شکێندراوە، پەشێو لێرەدا چەمکی شکاندنی بێدەنگی دەهێنێتە ئاراوە، کاتێ دەنگ دروست دەبێت مانای وایە بکەرێك لەپشتی ئەو دەنگەوە ئامادەیە، لەسەردەمی پێغەمبەردا بانگی ئیسلام کاتێ بەئاشکرا درا کە هێزی باوەڕداران بەرەو پەرەسەندن دەچوو، کاتێك هادی عەلەوی دەگاتە ئەو ئاستەی سنووری بێدەنگی بشکێنێت کە کەسێتی ئەو دەوری بکەرێکی ئامادە دەبینێت، بەواتا دەنگی ئەو بکەرە با لەئاستێکی لاوازیشدا بێت بەپێی ئامادەبوونی کۆمەڵایەتی و لەنێو پانتایی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا، کۆتایی هێنانە بەباری بێدەنگی، هەر لەوێشەوە سەرەتای دەرکەوتنی بکەرێك ئاشکرا دەبێت، بکەرێك کە دەشێ ئاسۆی گۆڕانکاری لەگەڵ خۆیدا بهێنێت مادەم گەیشتبێتە ئەو ئاستەی سنووری بێدەنگی بشکێنێت.

پەشیو بەگەشبینییەوە دەڕوانێتە دروستبوونی دەنگی رەتکردنەوەو پێی وایە ئەوە سەرەتای گۆڕانکاری دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێیە لەمێژووی وێرانی رۆژهەڵاتدا، ئەم گەشبینیەش دەبێتە کۆتایی یان قفڵی کۆتایی دەقەکەی، لێرەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە پەشێوە سەرباری ئەوەی کە بەچاوێکی رەخنەگرانەی واقیعی دەڕوانێتە رۆژهەڵات و عەقڵ و کلتووری رۆژهەڵاتی، هێشتا پێی وایە لەو واقیعە ناجۆرەدا زەمینەی گۆڕانکاری لەئارادایە، بەڵام ئایا ئەو گۆڕانکارییە چۆن و لەکوێوەو لەسەر چ بنەمایەك و کەی و کێ...



# نموونەی شیعرەکانی

# کاک

پێش ئەوەی بێمە بەر دەمت
کام بیری جوان، خرپەدارە
کام دێڕ هەڵبەست، زۆر بە کارە،
شانەی ئەکەم، وەك پەرچەمت!
لە ماوەی چاو قوچانێکا،
هەزار و یەك خەونی شیرین،
ئەمکەن بە"مەم"، ئەتکەن بە"زین"!
لە خەیاڵما،
پایز.. بەهاری، لێ ئەتکێ
درەختی رووت،
گەڵای سەوزی، پێوە ئەلکێ!
بەڵام! سەد ئاخ، ئەی دەروون پاك
کاتێ بانگم ئەکەی، بە"کاك"،
کاك.. وەکو مار،
بەرەو گوێچکەم، گینگڵ ئەدا
کە دێمە گۆ،
خۆی لە زمانم لوول ئەدا!
هێدی.. هێدی...
قووتم ئەدات، کفنی زەردی، نائومێدی!
من لە دڵتام..
لە دەروونتام..
لە گلێنەی، چاوی رووتتام
شەرم مەکە، بە ناوی رووت
ناوم بێنە، پڕ بە گەرووت
بالە یەکتر، ئاشکرا بین
تاکەی لە ناو ئاگرا بین؟
نەتۆ"خوشکە"ی، نە من"کاك"م
خۆشەویستی، دەروون پاکم!!

١٩٦٩-٦-٥

## لەدەستم دێ

"لە ساتێکا.. کە مرۆڤ نەبێتە چەپکێك دەماری تووڕە
هۆنراوەیێکی وا لە دایك ئەبێ"

لە دەستم دێ،
کاتژمێری، کامەرانیت، بوەستێنم
لە دەستم دێ،
ئەلقەی پەنجەت پێ فڕێ دەم،
نامەی بەختت، بسووتێنم!
لە دەستم دێ،
هەموو شتێك، ئاشکراکەم!
کام شەوت گەش و روناکە،
ئەو شەوی پف لە چراکەم!

. . .

لە دەستم دێ
بەدو وشە،
دڵی زاوای نوستوت.. رەش کەم
لە خۆشاوی،
شەوی پەردەتان.. بێ بەش کەم!

. . .

نامەکانت..
یەك یەك ماون
دیاریەیە سادەکانت..
یەك یەك ماون
چاویان شۆڕە..
دەست لە سەر سنگ، بۆم وەستاون!
لە تاوی ئەو کارەساتەم،
ئارەقەی شەرم ئەتکێنن
مۆری حەزێکی ئاگرین،
بە ناوچاوتەوە.. ئەلکێنن!

. . .

تاڵێکی پرچت نەماوە،
تێر تێر بۆنم نەکردبێ!
جێی دەرزی پێك،
لە سنگی برسیت نەماوە،
پەنجەم پەی پێ نەبردبێ!
گەواهی ئەدەن... لە سەرت،
دارتێلەکانی، سەرشەقام
گەواهی ئەدەن... ئەوانەی
نامەی تۆیان بۆ دەهێنام
بەڵێ گیانە...
گەر بمەوێ،
کاتژمێری، کامەرانیت، بوەستێنم
گەر بمەوێ،
ئەلقەی پەنجەت، پێ فڕێ دەم،
نامەی بەختت، بسوتێنم،
بەڵگەم پێیە!
هەزار بەڵگەی ئاشکراو روون
بەڵگەی.. چوارساڵ، پێکەوەبوون!
بەڵام! چبکەم؟!
خۆشەویستیت..
نەهەنگێکە،

خوێنی هەڵچووم.. ئەخواتەوە
خۆشەویستیت..
رووبارێکە،
قینی ڕەشم، ئەشواتەوە!

١٩٧٠/١/٢١

# هۆنراوەیێکی ساکار

خۆشەویستم
رۆژێ دادێ
گڕ بەربێتە، شارو لادێ
رۆژێ دادێ..
کورد بپرسێ:
کەی ڕەوایە،
لێك بپچڕێ، گەردانەکەی، کەژ و کێوم
بکەین بە کێڵگەی کارەبا،
بە گۆڕستانێکی هەرزان!
لە پاڵ تاوێرە بەردێکا.. سەنگەر بگرین
یا دێینەوە دەست لە گەردن،
یا دەست لەسەر تفەنگ.. ئەمرین!

١٩٧٠-١-٢٢

# شەونامەی شاعیرێکی تینو

(١)

خۆشەویستم
کە شەو دادێ...
شەوی پایز
کاتێ.. خشپەی گەڵای وەریو
پەلی هەستم ئەگرێ و... ئەیبا،
بۆ کۆتایی و دونیای ئەو دیو
من، بەخیلی بە کۆتایی گەڵا ئەبەم
چونکە! کە مرد، هاورێی هەیە
دەمی زەردی، بنێتە دەم!

(٢)

خۆشەویستم
کە شەو دادێ..
شەوی زستان
کاتێ.. دەنوك، لە گوێم ئەدا.. ترپەی باران
کە خوڵەمێش، دائەپۆشێ،
پۆلوەکانی ناو ئاگردان:
لەسەر دیواری بەردەمما،
سیمای تەڵخی، دڵدارەکانم، ریز ئەکەم
چی‌یان لێ هات؟!
بۆ رۆیشتن؟!

دەربەستی هیچیان نیم... بەڵام،
بەڵام، ئاخ.. بۆ ئەوەی یەکەم
کە ناتوانم لە بیری کەم!

(٣)

خۆشەویستم
کە شەو دادێ..
شەوی بەهار
کە تاریکی.. وەك تاڤگەی کل،
ئەرژێتە ناو گلێنەی شار!
کە ئەستێرە.. گەڕانەوە،
لە ناشتنی،
تەرمی.. ماتی، زێرکفتی خۆر
کە پەنجەیێ،
هات.. بزواندی،
تەلی گیانی پڕ لە ناسۆر:
بڕوابکە، خۆشەویستم،
لەو کاتەدا..
بۆ خەوێکی سەر مەچەکت،
ئەگریم.. ئەگریم
بەگیان.. بەلەش.. بە چاو.. بەگوێ،
هاوار ئەکەم:
برسیم.. برسیم!

(٤)

خۆشەویستم
کە شەو دادێ..
شەوی هاوین
کاتێ.. ئاسمان،
پەپوولەی خەو ئەبارێنێ.. خەوی شیرین!
کە سروەیێك، دێ.. بەکپی،
بەگوێی ناخما، ئەچرپێنێ،
رازی شەوو چوار دەورەم و کوللەی سپی:
بڕوابکە، خۆشەویستم،
لێرەدا.. دڵی هەتیوم،
دڵی شەوی گەش نەدیوم،
وەکو مانگی تەنیای ئاسمان،
تێر.. ئەداتە، پرمەی گریان!
گریان.. بۆ چەرپای دوو کەسی!
گریان..
گریان..
بۆ چەناگەو بەر گەردنێ..
بۆ ئافرەتێ،
تا بەیانی، سەر بە سەر سنگمەوە بنێ!
گریان.. بۆ یەك چرپەی شیرین!
گریان.. بۆ یەك خورپەی شیرین!

١٩٧٠-٧-١٩

# بۆ پارچەکەی ترم

خۆشەویستم
بوبە سالیّ
چاوت.. دەستی، چاوەکانی، نەگوشیوم
بوبە سالیّ،
ئاوریشمی قژ.. شان و ملی، نەپۆشیوم
بوبە سالیّ،
گوێم.. تامەزرۆی، رۆژباشێکە!
گوێم.. تامەزرۆی، گیان باشێکە!
بوبە سالیّ،
تینوترم،
لە گەلأی زەردی هەلوەریو
تینوترم،
لە بیابانی، هەزاران سالّ.. باران نەدیو!

*

کتێبەکان..
گەرمایی تۆم، پیّ نابەخشن!
بالندەکان..
چریکەیان، تامی چپەی شیرین نادا
ئەو بتانەی،
لە دوای تۆ هاتنە پەرستگام،
بە یەك سروەی بیرەوەریت، دێن.. بەلادا!

*

وەرە گیانە..
لە تۆلەی خۆم..
لە تۆلەی تۆ..
لە تۆلەی ئێسکی ناو گلکۆ..
لە تۆلەی مەم..
لە تۆلەی زین..
هەزاران مەم، هەزاران زین،
کارتۆنەکان... بسووتێنین
دیوارەکان.. بڕووخێنین
جامبازەکان..
-ئەوانەی.. وەك پارچەیێ گۆشت
تۆیان برد بۆ هەراجخانە..
تۆیان فرۆشت-
وەرە گیانە..
برۆو سەریان، با بتاشین!
هەشی پیاکەین!
گەر مەم و زین، وایان نەکرد،
ئەدی ئێمە بۆ واناکەین؟!
دەپێم بلیّ، بۆ واناکەین؟!

١٩٧٠-١٢-٢٧

# درەنگ نیە

(١)

خۆشەویستم
کە ژوورەکەم، جیّ ئەهێلێت،
تیشکی خۆر، لە ژوورەکەما،
بوخچەی خۆی، ئەپێچێتەوە!
میلی سەعات،
خولی لە یاد ئەچێتەوە!

. . .

کە ژوورەکەم جیّ ئەهێلێت.. لە لام ئەڕۆی
چوار دەورەم.. وەك دارەمەیتیّ،
هەستی سرِم، ئەگرێتە خۆی!
لە پەنجەرەو دەرگاکەوە،
بۆ بێنم دیّ، دەستی زریان
کتێبخانەی، بچکۆلانەم،
دیوارەکان...
هەموو یەك یەك، دێنە گریان
لەگەلّ منا، دێنە گریان!

(٢)

خۆشەویستم..
دونیا ساردە...
ئاو شەختەیە..
دلی تەنیام هەلپەیەتی
بو لێونکی، گەرم.. گەرم..
گەرم.. وەکو، پشکۆی پەتی!

(٣)

چ رووئەدا، باروبدا!
دلنیابە.. جێم مەهێلە
بارەشی من.. بەهەشتێکە،
ئەتپارێزیّ، لە رەهێلە

*

جێم مەهێلە
درەنگ نیە
بانیگای چاو، دلنیابیّ
ئێستا.. خۆرت بۆ رائەگرم،
ناهێلم وا زوو ئاوابیّ!!

١٩٧١-٤-١١

# زامی زیندوی شیللی*

ئەشێ.. تاریکی و تیشکی خۆر، بە یەك بگەن
ئەشێ.. زەوی و سێنی ئاسمان، بەیەك بگەن
ئەشێ.. قوتبی سەروو خواروش بە یەك بگەن
بەڵام! هەرگیز، ناشێ من و خۆشەویستم..
بەیەك بگەین!

*

ئەشێ.. ئەهریمەن.. بەهەشتی،
خوای بەرکەوێ!
ئەشێ.. رووبار،
روو لە هەوراز بێو سەرکەوێ!
ئەشێ.. مەم زیندوو بێتەوە،
لەسەر سنگی زین بسرەوێ!
بەڵام ناشێ،
جارێکی تر،
منی دڵدار، بگەم بەوەی خۆشم ئەوێ!

*

ڕەنگە.. کچە دراوسێکەم
یا.. ئەو کچەی،
ئەمڕۆ.. سبەی،
ئەڵقەی من ئەکاتە پەنجەی،
واتێ بگات
پەلکەزێڕینەی هۆنراوە،
بۆ کەمەری ئەو.. ڕێك ئەخەم
بۆ ئەو تۆقەی زێڕینی خۆر،
لە پرچی ڕەشی شەو ئەدەم!
نەیزانیوە..
هۆنراوەی من بۆ کەسێکە،
کاسە خۆشاوێ بو.. رژا
چەپکە بۆنێ بو.. بە نوێنی،
کەسێکی ترا.. هەڵپڕژا!

١٧-٥-١٩٧١

**پەراوێز:**

*شیللی: شاعیرێکی رۆمانتیکیی ئینگلیزە

**سەرچاوە:**

شەونامەی شاعیرێکی تینو، عەبدوڵلاپەشێو، چاپی یەکەم-١٩٧٢-بەغدا.



## کودەتا

پێش تۆناسین
منالێکی خۆپەرست بووم:
وام دەزانی،
ئاسمانی پان دەوارێکە،
تەنیا بۆ من هەڵدراوە.
زەوی دوڕگەی دوای تۆفانە،
جگە لە من،
هیچ کەسێکی تیا نەماوە.
ئەوینی تۆ لەپڕهات و
شوورە و قەڵامی خاپوور کرد،
ڕەنگەکانی هەموو گۆڕی،
یاساکانی ژێروژوور کرد،
وای کرد دنیا
بۆ تەنیاییم وەك قەفەس بێ.
فێری کردم-
شەوان نیو سەرینم بەس بێ!

١-١٢-١٩٧٣
ڤارۆنێژ

## فوتبۆڵ

ئاژانسەکانی دەنگوباس ڕایانگەیاند:
یارییەکی فوتبۆڵ دەکرێ.
دوو تیپەکە- کرێمل و کۆشکی سپی.
تۆپ- سەری کورد
گۆڵ- کوردستان.
تەماشاکەر- دنیای کری وەك گۆڕستان!

٣-١١-١٩٧٤
مۆسکۆ

## مۆسکۆ

تا ئەمڕۆ چەندجار
دڵی بێلانەم، بۆ شۆڕەشیعرێ،
داخورپا، لێیدا،
وەك زەنگی دێرێك بۆ نوێژ لێ بدرێ.
"ئەمڕۆنا، سبەی..."
"ئەمڕۆنا، سبەی..."
ئەی زمانەکەم!
خۆ ئەتۆپەیکی بەستە و بڵێسەی،
کەی لە داوێنی پەیکەری پۆشکین
مۆمێك پێ دەکەی؟
ئێ دە کەی؟
کەی؟
کەی لە کڵێسەی
شۆڕ و ئەوینی ئەم نازدارەدا
زەنگێك لێ دەدەی؟
لێدە، دەی!
دەی!
. . .
ئەی مۆسکۆی جوان،*
ئەی مەڵبەندی
گوڵ و بەفر و هەمیشە ژوان!
لە ئامێزی نەرمی تۆدا،
بۆ یەکەم جار،
بە ئاشکرا،
بەسەرهاتی ئاڵایەکم گێڕایەوە،
کە هەڵنەکرا.
بۆ یەکەم جار،
بە ئاشکرا،
نەخشەیەکم لە دیواردا
(ئەوەی بەڕۆژ
لە ئەتڵەسی دنیا دزرا).
بۆ یەکەم جار،
بەئاشکرا،
مزی هەڵبەست:
دەست و کوڵم،
لێو و گوڵم
پێشکەش کرا.
بۆ یەکەم جار لە ژیانا،
چاوم شەرمی لە خۆرشکا،
بۆ ئافرەتان،
جێی ژوانم
لە شوێنێکی ڕووناك دانا.
. . .
ئەی مۆسکۆی جوان،
ئەی مەڵبەندی
گوڵ و بەفر و هەمیشە ژوان!
دەگێڕنەوە،
دەڵێن، گۆران
بەبینینی
دووچاوی"پڕلە هەستی جوان"**
لێوی سیسی بووە کانی،
ترۆپکێك بوو،
ژانی گرت، هەژا، خرۆشا،
پڕی کردی لە گۆرانی!
من گۆران نیم،
بەڵام... ڕەگم
چۆڕێك خەم و داخورپانی
گیانی ماندووی ئەوی تیایە.
من لووتکە نیم،
بەڵام...
دەشێ...
کڵاوەی سەوزی گردێك بم،
کە لە سایەی لووتکەدایە.
ئەی نازانم،
تاکوو ئەمڕۆ
چەند دڵۆپە زەردەخەنە و فرمێسکی گەش:
(هی چاوی کاڵ،
هی چاوی شین،
هی چاوی ڕەش...)
لە گێژەنی شەوەزەنگی غەریبیمدا
سووتان.وەك مۆم،
درەوشانەوە وەك چرا...
ئەی نازانم...
بۆچی لە بەر ڕووناکییان
شیعرێکم بۆت پێ نەنووسرا؟!
ئەی مۆسکۆی جوان،
ئەی مەڵبەندی
گوڵ و بەفر و هەمیشە ژوان!

١٨-١-١٩٧٩
مۆسکۆ

*دەربڕینێکی گۆرانە لە هۆنراوەی"مۆسکۆی جوان"دا.
**دەربڕینێکی گۆرانە لە هۆنراوەی"وەڵامی پرس"دا.

## مەرج

من قەت دژی ئەوەنیم
دکتاتۆر جیهان بگرن،
سێبەری خوابن، زۆربن.
بەڵام مەرجێکم هەیە:
منالان دکتاتۆر بن!

٢٢-٢٣-١٠-١٩٧٩
بەرلین- وارشۆ

## ئێمە درەختین...

ئێمە درەختی زڕ و بێبەر نین،
تا لە چوارلاوە بمانبڕنەوە.
ئێمە تووتن نین،
چەرچی و بازرگان
بمانفرۆشن و بمانکڕنەوە.
ئێمە بە هەنیەی دنیاوە تف نین،
بە سووکەدەستێک بمانسڕنەوە.
ئەو دڵە پاکەی
کوانەنەوتێکی داگیرکەرانە-
سبەی ملیۆنان ڕمی باڵدارە.
ئەو نیشتمانەی
بەردەبازێکی بەرپێی هەمووانە-
سبەی ملیۆنان سەنگەری سوارە.
. . . .
هەستن، هەڵۆی شاخان، هەستن!
لە هەستاندا ئێوە یەکن:
یەک بیر،
یەک ڕێ،
یەک مەبەستن.
هەستن، هەڵۆی شاخان، هەستن!
لە هەستاندا ئێوە زۆرن:
چل ملیۆن چاو،
چل ملیۆن قاچ،
چل ملیۆن مەچەک و دەستن.
هەستن، هەڵۆی شاخان، هەستن!

٢٢-٤-١٩٨٠
مۆسکۆ- وارشۆ



## جیهان

جیهان- قەحپەیەکی کەرە
جیهان- قەحپەیەکی لاڵە.
هەر کەسێکی بە چۆری نەوت
بەندەخوێنی نەکاتەوە،
فەرهادێکی ڕەنجبەتاڵە!
جیهان- قەحپەیەکی کەرە.
جیهان- قەحپەیەکی لاڵە.

ئەمڕۆ نییە،
دەیان ساڵە،
ئەشکی چاوم
زەنگوڵ زەنگوڵ. دانە دانە،
خوێنی دڵم
دڵۆپ دڵۆپ، دانە دانە،
بۆ گەردنی شووشەنەوتێک
دەکاتە مۆریی گەردانە!

١٩٧٩
مۆسکۆ

# فەرهەنگۆك

## ئـ

ئاپۆرە: قەرەباڵغی، هەزارەزیلە، کەرەسیسەی خەڵك

ئاتەشگە: ئاتەشکەدە، ئاتەشخانە، ئاورگە، شوێنی ئاگری پیرۆزی زەردەشتییان.

ئادگار: سیما، چەهرە، بچم(ملامح)

ئاگرپارە: بزێو، نائارام، زیتەڵ، زیت، سەرهار، بزۆز، مرۆی وریا و چەتوون(زێتر بۆ منالان بەکار دێ)

ئالارم(فەرەنسی): کاتژمێری زەنگدار، سەعاتی زەنگلدار

ئاڵۆش: خارشت، خورشت، خوروو، شپلپرە

ئاودامان: دەرەدامان، وەستەرە، خەفتان، پۆشاکی شۆڕی تا سەر پێیان

ئاوێزان: دالەقاو، هەڵواسراو، شۆڕەوەبوو

ئەستێرەبەندان: تەنرانی ئاسمان بە ئەستێران، ئەستێرەڕێژبوونی ئاسمان(سەهۆڵبەندان، خەنەبەندان).

ئەلها: ئارەزوو، کەڵکەڵە، مگێز، حەز

ئەنگاوتن: هنگافتن، پێکان/ بئەنگێوە: بپێکە

ئێزنگ: کزرەدار، کۆلی، چینەدارێکی ئامادە بۆ سووتاندن.

ئێکسپرێس(لاتینی): پۆستەی خێرا

## ب

بابوێر: کونەبا، لۆنکە، بادرز، دەرەزێك بای لێوە بێ

باراندیدە: بارانەیتە، دنیادیدە، خاوەن ئەزموون.(دەگوترێ: فلان کەس گورگی باراندیدەیە)

بازرەقەبەستن: دەرپەڕینی لە پڕی گیانداران یا فیچقە کردنی شلەمەنی

باڵئەنگێوراو: باڵئەنگاوتە، باڵپێکراو، باڵشکاو، لە باڵدراو

برك: برکە، پنجی بێستان(برکە کندۆرە، برکە تەماتە...)

برووسکاوێژ: برووسکەهاوێژ، برووسکەوەشێن، چەخماخەدەر، ئەوەی دەبرووسکێنێ

بژوێن: سەوزەڵان، مێرگ، دەڤەری پرگیا و لەوەڕ

بنزەویگەڕ: ئەوەی لەبن عەرد بە دوای شتێکدا دەگەڕێ

بنێس: لەڕ و لاواز، بێشنگ، وتافەت، سیس و دەردەدار

بۆڕخواردن: تێشکان، بەزین، دۆڕاندن لە ململانێدا

بولێڵ: بولێڵە، گورگومێش، تاریگەور، تاریکولێڵ، شەوەکی، تاریك و روونی بەیانی یا ئێوارە.

بوومەلەرزە: بوولەرزە، عەردهەژ، عەردلەرزین، زەلزەلە

بوولەرزە: بوومەلەرزە، عەردهەژ، عەردلەرزین، زەلزەلە

بەدووم: بەدیۆم، شووم، نەحس، پێوقدووم ڕەش

بەرامە: بۆنی خۆش

بەرچنە: بەرچن، سەلك، قەرتاڵەی گچکە، سەبەتەیەکی بچووکە میوەی تێدەکرێ

بەندەن: شاخوداخ

بەهێ: بەی، بێ، هێوە

بیبیلە: پیپۆك، بیبلك

بێخولیا: خەمسارد و بێهەوەس

بیستۆك: گوێچکەی تەلەفۆن

بێشەڵان: لێڕ، دارستان، لێڕەوار، مێشە، جەنگەڵ، بڕ

پێکراو: ئەنگاوتە، ئەنگێوراو

بێن: پشوو، وچان، هەدا/ بێنێك: وچانێك، کەمێك، پشوویەك، ماوەیەکی کەم

بینا: چاو ساغ/ نابینا: کۆرە، کوێر

## پ

پاوان: قەدەغە، قۆرخ، مێرگ یا لەوەڕگەیەك موڵکی کەسێك بێ و قەدەغە بێ بۆ کەسانی تر.

پرشنگەجاڕ: مەڵبەندێك تیشك و ڕووناهیی تێدا بڕوێ(نێرگزەجاڕ، مەرەزەجاڕ...)

پرێسکە: پریاسکە، بوخچەکەیەك کە شتێکی کەموزۆر بە نرخی تێدا وەشاردرابێ

پژان: پرژان، پشکووتن، بوونەوە/ زمانپژان: زمانبوونەوەی منداڵان، زمانگرتنی زارۆکان

پلوورە: خلێف، خەلێف، کولێری هەنگ، کوورەی هەنگ، کەندووی مێشە هەنگ، ئەو شوێنەی هەنگ شانەی تێدا هەڵدەبەستێ، بەتایبەتی لە ناو کلۆری قەدی داردا

پەتا: درم، ئاهۆ، قڕان، نەخۆشیی گیرۆ

پەرجۆ: پەرجوو، موعجیزە

پەروانە: پەپوولەی ڕووناکیپەرست

پەرەنگ: پشکۆ، سکڵ، پۆلوو، پۆلی، پەنگر، گۆی گوارە، لەرزانەی گوارە/ چاوپەرەنگ: چاو پشکۆی ئاگر

پەسار: پەنا، پەسێو، نوا، ئەنوا

پەلوپۆ: لکوپۆ، لق و پۆپ

پەنگر: پەرەنگ، پشکۆ، سکڵ، پۆلوو، پەل

پەپڤ: ووشە

پەیك: تەتەر، چەپەر، نامەبەر، قاسید

پێت: بڵێسە، بلێز، کلە، گڕی ئاگر

پێخەو: پێخەف، نوێن، جێخەو،نڤین

پێل: شەپۆل/ پێلدان: شەپۆلدان

ت

تاتا: هەوداهەودا، تاڵ تاڵ، داوداو

تاپۆ: تارمایی، ڕەشانگ، سامۆتك

تاتەشۆر: ئەو بەردەپانەی مردووی لەسەر دەشۆن

تافە: هاژەی جۆگە و ڕووبار، خوڕەی ئاو

ترۆپك: قوللە، کۆپ، کومت، لووتکە، تۆقەڵە

ترووسکاندن: بریسکانەوە، چرسکان، تەیسین

ترووکە: جریوە، سۆما، ورشەوگرشەی ترووسکەی ڕووناکی

ترووکان: ترەکان، ترەکیان، جووقانی تۆکڵی هێلکە و شتیوا

ترووکاندن: شکاندنی تۆکڵی هێلکە و شتی تر بە دەنووك

تژی: پڕ، مشت، کەیل، لێوانلێو

تووڕدان: فڕێدان، تێهەڵدان

تۆف: کڕێوە و سەرما وسایەقە

تۆمار: کاغەزێکی بە خەتی خۆش نووسراوی لوولدراوە

تونێل: ڕەهەند، نەفەق، ڕێگەی ژێرزەمینی

تۆشە: تێشوو، توێشە، خۆراکی ڕێگە

تێشوو: توێشە، تۆشە، خۆراکی ڕێگە

توون: کولخان، توونخانی حەمام

تەپکە: دەفکە، دامە، جۆرە داوێکە بۆ ڕلوەمەل

تەپونم: مژ و دومان، تەمومژ و بارانێکی لەسەرخۆ پێکەوە

تەرز: توولە، لکی ساوای باریك و پێچپێچی بڕکی بێستان و مێو و شتی تر

تەلان: هەوراز، زوورگ و هەڵەت، گرد

تەوێڵ: ناوچەوان، ئەنی، هەنیە، پێشانی

تەیارکردن: ئامادەکردن، سازکردن

تێڕووبوون: تێڕووهاتن، پڕپێداکردن

تیرێژ: تیرۆژ، تیشکی خۆر

ج

جاویدانی: نەمر، ئەبەدی، هەمیشە زیندوو

جریواندن: زریواندن، شنینەوە، شنەشنکردن، چکدان، تەیسین، چرسان، درەوشانەوە و ترووکە ترووك کردنی ئەستێرە

جزوویەندکردن: لە بەرگگرتنی کتێب بە لێکدروونی بەندەکانی.

جێژوان: ژوانگە، جێی پێکگەیشتن

چ

چاخ: سەردەم

چاومار: چاوتیژ

چاونماوی: چاوتەڕ(بەفرمێسك)

چرکە: سیکوند، سات، چرکە سات، لەحزە/ چرکەژمێر: سیکوندژمێر، ساتژمێر(میلی ساتژمێری ناو سەعات)

چرووت: سیگارێکی گرانبەهایە، کووبا پێی بە ناوبانگە.

چریسکانەوە: بریسکانەوە، بریقانەوە

چڵۆپك: چڵۆك، چڵووك، چڵەپۆپە، ترۆپك، کۆپیێ داریێ، سەرکەلی درەختان، بڵندترین چڵی درەخت

چۆمەلان: دەڤەرێك چۆم و ڕووباری زۆربێ

چەپەك: جێی پەنا، شوێنێك هاتوچۆی بە سەرەوەنەبێ.

چەپاڵەدان: چەپاردەدان، پەنادان، دالدەدان، بەهاناوەهاتن

چەمبەر: چەمەر، ئەڵقە، بازنە، خەلەك

چەوتوچەوێڵ: خوار و خێچ

خاترجەم: ئەرخەیان، تەنا،دڵئاسوودە، دڵنیا، سەرڕەحەت

خاسەڕەنگ: ئەو ڕەنگەی ناچێتەوە. گلێکی سوورە بۆ دەرمان و ڕەنگکردن دەشێ

خاڵۆزە: خەلووزە، نەخۆشییەکە تووشی بڕکی بێستان دەبێ.،

خڕ: هەموو، هەمی، تەڤ، گشت

خرینگە: خرنگە، زرینگە و زڕەی پێککەوتنی کانزا

خۆر: ڕۆژ، تاڤ، هەتاو

خوڕین: شانازی کردن/ پێت دەخوڕم: پێت دەنازم

خۆڵەکەوە: خۆڵەمێش، خۆڵەمڕ، خولی، بووڵ، مشکی، وەلە

خولیا: مەراق، کەڵکەڵە، سەودا

خوناو: خوناڤ، ئاونگ، شەونم

خوناوکە: نەرمە بارانی پشك ورد/ خوناوکەکردن: وردبارینی نەرم و بەکاوەخۆ

خەزان: گەلاڕێزان، وەختی خەزەلوەر

خەپەتۆڵە: منالێ یا بێچووی گیانداری گۆشتن و خڕکەڵە

خەفەکردن: خنکاندن، فەتساندن، تاساندن

خەمل: خشڵ، تیتك، کەرستەی ئارایش ڕازانەوە

خەملاندن: ئارایشدان، ڕازاندنەوە، جوانکردن، تیفتیفەدان

خەملیو: ڕازاوە

خەمیژگە: سووکەخەم، وردەخەم، تەنکەخەم

خەوزڕان: خەوڕەوینەوە، دژخەوبوون

خێو: خاوەن، ماخۆ، خودان، وایر

د

دابینبوون: ئارامبوون، داسەکنان، هەدادان، هێورین

داپەڕین: کەوتن لە بەرزاییەوە بۆ خواریێ بەخێرایی

داکردن: بەخوڕبارین/ داکە: ببارە

دارەبەن: دارقەزوان، داری بنێشتەتاڵ

داوەڵ: داهۆڵ، داڵەهۆ، داڵۆ، داوڵ، قەیلۆك، دارێکە لە ناو شینایيدا پەڕۆی تێوە دەئاڵێنن بۆ ڕەواندنەوەی باڵداران

دلۆڤانی: میهرەبانی، دڵجۆیی، دڵنەوازی

دڵێزگە: دڵی بچووك و ژێکەلانە(کوڕیزگە، ماڵیزگە، خەمیزگە، پیاویزگە) ئەم پاشگرە زێتر لە خۆشەویستییان دەگوترێ

دۆ: کچی ناو شایی

دۆئاسایی: وەکو کچی ناو شایی

دورگە: گراڤ، جەزیرە

دوورەدەست: دووردەست، عاسێ، زۆر دوور، شتێك یا کەسێك کە بە زەحمەت چنگ کەوێ

دوند: ترۆپکی چیا، قوتکە، قوللە، تۆقەڵە

دەراو: ئاوی دەرەوەی ئاوایی

دەربردن: تەحەممولکردن، دەرۆستهاتن،/ دەرنابەم: تەحەممول ناکەم،دەرۆست نابێم، هەڵناکەم

دەرزیئاژن: دەرزیکوت، بە دەرزی کون کون

دەستەچیلە: دەستەچیلکە، بنئاگر، چاوئاگر، چاوڕەشکەنە، دەساگر، دەساور، چیلکە و پووش و پەلاش بۆ ئاگر کردنەوە

دەسنێژ: دەستچێن، دانەخۆرە و پەروەردەی دەستی کەسێك

دێوەرە: دەسگێڕ، چەرچی، دەسفرۆشی گەڕۆکی لادێ

ڕاداشتن: دەست یا پەنجە هەڵبڕین بۆ نیشاندانی شتێك یا کەسێك. /پەنجەڕاداشتن: نیشارەت کردن

ڕازان: نووستن، خەوتن

ڕاستهاتن: تووشهاتن، هەڵەنگووتن لە کەسێك یا شتێك

ڕچە: باریکەڕێ، ڕێچکە، بزنەڕێ/ ڕچەشکاندن: کردنەوەی ڕێیەکی تازە بۆ پێداڕۆیشتن

ڕسکان: گەشەکردن، ڕوان و فراژی بوون و نەشونماکردنی ڕوەك و گیانداران

ڕنۆك: جینجرۆك، چنگورك، چنگی دڕندە و باڵندەی گۆشتخۆر

ڕووتەن: ڕەقەن، زەویی قاقڕ، تەمتەم، تەمتەمان

ڕۆشنا: ڕووناك، ڕۆشن

ڕۆندك: ڕۆنتك، فرمێسك، ئەسر، ئەسرین، هێستر، ئەشك

ڕەتدان: نسکۆهێنان، ڕەتبردن، ساتمەکردن، نووچبردن، نووچدان، هەڵەنگووتن، سەرەنگرێبوون

ڕەخش: هەسپە بە ناوبانگەکەی ڕۆستەمی زاڵە

ڕەشمە: ڕێشمە، هەوسار

ڕەشمیری: جۆرەترێیەکی ڕەشی تامویۆخۆشە، خۆشناوەتی پێی بە ناوبانگە

ڕەمیا: تەرە، ڕاونراو، هەڵەتەبوو، سەرادوونراو

ڕەوەز: کەپکەشاخ، گابەردی زۆر گەورەی چینچینی کێو

ڕەوەك: سرك، سڵ، قوشقی، تۆڕ.

ڕەها: ئازاد، سەربەست، بەرەڵلا/ ڕەهاکردن: ئازادکردن

ڕێنما: ڕێنوێن، ڕێبەر، ڕێنیشاندەر، چاوساغ

ڕێنوێن: ڕێنما، چاوساغ، ڕێبەر، ڕێنیشاندەر

## ز

زات وەبەرنان: هاندان، غیرەت وەبەرنان

زارۆ: زارۆك، منال

زڤرین: گەڕانەوە، ڤەگەڕ

زمانەگا: ئەستوورکی منداڵان، جۆرە کولێرەیەکی درێژکۆلەی زماننماسایە بۆ زارۆیان دەبرژێندرێ.

زۆزان: کوێستان، لەیلاخ

زەردەچێوە: زەردەچەو، زەردەچوو

زەرنەقووتە: ساقەسۆرە، بێچووی ساوای باڵدار

زەلال: زوڵاڵ، ڕوون(بۆ ئاو)، ساف(بۆ دەنگ).. هتد

زەنا: ژاوە، دەنگەدەنگ، قیژەقیژ، هەراوهۆریا

زەندەقچوو: زراوچوو، ترساو، تۆقیو

زەویزادە: لە تۆرەمەی خاك، لە زەوی پەیدابوو، زادەی خاك، کەسێك یا شتێکی نائاسمانی

زێد: مەفتەن، نیشتمان، وڵات، شوێنی لەدایکبوون

زێروو: زەروو، زیلوو، کرمێکی ڕەشی خوێنمژە

زیوان: زیڤان، زیزانە، دەنکێکی ڕەش و تاڵە لە ناو گەنمدا

## ژ

ژاوە: زەنا، دەنگەدەنگ، قیژەقیژ، هەراوهۆریا

ژێ: ژەە، تەل، وەتەری ئامێری موزیك

ژێکردن: بڕین/ سەرژێکردن: سەربڕین، کوشتنەوە

ژیلە: ژیلەمۆ، زیلەمۆ، چریسك

ژیلەمۆ: ژیلە، زیلەمۆ، چریسك

## س

ستێر: ئەستێرە، هەسارە، ئەختەر

سرك: ڕەوەك، سڵ، قوشقی، تۆڕ.

سریواندن: جریواندن، زریواندن، درەوشانەوە، شنەشنکردنی ئەستێرە و چرا و شتی تر جریواندنی تەیروتوار

سفرە: خوان

سمین: کونکردن

سووتمان: شەوات، ئاگربەربوونەوە، ئاگرکەوتنەوە، حەریق

سووسەکردن: هەستکردن و پەیبردن بەرازو نهێنی

سەربەمۆر: سەرمۆر، نەکراوە، دەست لێ نەدراو

سەرمۆر: سەرمۆر، نەکراوە، دەست لێ نەدراو

سەرپێوەنان: ڕەوکردن، پێکەوە، مل بەرێوەنان بە کۆمەڵ/

گیاوگۆل سەری پێوەناوە: گیا باڵای کردووە و لەبەر باکەروێشکە دەکا، بەدەم ڕەوکردنەوە شەپۆلان دەدا

سەربەکڵاوە: سەربەقەپووچکە، بارانی پشك درشت

سەروبەرکردن: هەتەر کردن، نیشانە نەپێکان، وە ئامانج نەکەوتن، سەرچیخچوونی تیر و گوللە و شتی‌تر

سەنگرانەوە: پرینگانەوە، سڵەمینەوە، ڕەوینەوە

سەوزەڵان: دەڤەری پڕ مێرگ و مێرغوزار، چیمەنزار

سیپەلك: سی، سەپەلیك، شووشوو، پیلاسپی

سێرە: بازنۆکە(ئەڵقە)ی سەر لوولەی تفەنگ بۆ نیشانەلێگرتن

سیسارك: سیسارکەکە چەڵە، سیسالەك، مەلێکی لاشەخۆرە

### ش

شەقەل: داوێن، دامەن، تەشك، پەراوێزی خوارەوەی کراس و کەوا و شتی تر/ شاقەلشۆڕ: داوێنشۆڕ، ژنێك پۆشاکی ئاودامانی لەبەردا بێ(لە کوردەواریدا پەسندە)

شلێوە: شلۆقە، بەرخورك، دوودانك، بارانی بە بەفرەوە

شنەشن: ترووکەترووکی ڕووناکی، یا لەرەی دار و درەخت

شنینەوە: لەرینەوە، جریواندنی ئەستێرە، تریقانەوە و پێکەنینی منداڵی ساوا

شوارگرتن: نەبز گرتن، نزڵەگرتن

شۆر: ئەڤین، دڵداری، عیشق، سەودا

شۆرابە: هەورێکی زۆر تیر، کە زگی دادابێ و لە ڕاستی ئاسۆ داوێنی بگاتە زەوی

شەبەق: شەباقە، کونی گەورە، شەفەق، گەردوگوڵی بەیان، زەردەی بەرایی ئاسۆ

شەپاڵ: بەچکەشێر

شەتاو: جۆگەیەك ئاوەکەی هی بەفری تواوە بێ

شەقڵ کردن: نیشانکردن، مۆرکردنی خەرمان یا هەر شتێکی تر بۆ ئەوەی دەسکاریکردنی دیاربێ

شەلاڵ: سەراپا تەڕ(شەلاڵی خوێن و ئارەقە و... هتد)

شینکە: سەوزەڵان، گیا جاڕ

### ف

فرگە: فڕۆکەخانە، باڵافڕخانە، تەیارەخانە

فێبڵ(لاتینی): ئەزیرە، ئەزیلە، ئەزیرۆکە، کورتەچیرۆکێك کە مانایەکی کۆمەڵایەتیی هەبێ، پاڵەوانانی فێبڵ زێتر گیانەوەرن.

### ق

قامك: پەنجە، ئەنگوست، تلی، پل، تیلك

قانگدان: دەرپەڕاندنی گیاندار بە دووکەڵ

قنیات: تەسەلا، قەناعەت/ قنیات کردن: قایل بوون، دابین بوونی کەسێك بەو بەشەی پێی براوە

قۆپەن: قانەگیا، کۆمەگیای بڵند و پاراو لە ناو شینایيدا

قورینگ: قولنگ

قوو: باڵندەیەکی سپیی مەلەوانی قازئاسایە(بە دەگمەن ڕەشیان تێدا هەڵدەکەوێ)

قەتاربەستن: قەتارەبەستن، ڕیزبەستنی یەك لە دوو یەك، سەر لەدوویەکنان

قەتیس: گیرۆدە، گیر خواردوو. حاسێ

قەتیسمان: گیرمان، حاسێبوون، بەندبوون

قەف قەف: ئاڵقە ئاڵقە، گەوگەو

قەڵغان: سپێر، سوپەر، مەتاڵ

قەندەهاری: جۆرە گەنمێکی پەسندی کوردستان

قیبلەنما: ڕووگەنما، کۆمپەس، بۆسەڵە

قیتەڵ: گیانداری زیتەڵ، گیانداری بچکۆلانە و قنج و وریا

### ك

کارگ: کوارگ، قارچك

کازێوە: کازیوە، گورگومێش، شەوەکی، بەرەبەیان، گەردوگوڵی بەیان، تاریکوڕوونی بەیان

کاڵەك: کلاش، پێڵاوی چەرم

کام: ئاوات، ئارەزوو، مراز، ئامانج

کشان: خوشیان، خوشین، ڕاکشانی ئەستێرە، خزینی لەپڕ و بەلەزی ئەستێرە یا هەر چاوگەیەکی تری ڕۆشنایی

کۆد: شیفرە، ڕەمز یا سیمبوڵێك کە دوو تەرەف لە نێوان خۆیاندا لەسەر ماناکەی ڕێك کەوتبن

کووژەکە: مورا، لەپکە، مووروویەکی شینە بۆ چاوەزار

کۆتك: کاسە، یا دەفرێکی دارینە لە لادێ بۆ دۆ و ماستاو و شتی وا بەکار دێ/ کۆتکەدۆ: کاسەی لە دۆ تژی

کۆتەرە: کۆلکەدار، قەدی دارێکی براوە

کولیلك: کولووك، شکۆفە یا گوڵی گژوگیا و دارودرەخت

کۆمە: کۆما، کۆمەڵەشتێکی کەڵەکەکراو

کونبڕکردن: ئەفەسبڕکردنی دەروديوار، گرتنی کون و کەلەبەری جێیەك

کۆنتراکت: قۆنتەرات

کونچە: کونجك، کونی زێدە وردیلەی پێست، مەسامات

کەپکەشاخ: قیتکایی شاخ، کلاوەی زەقوزۆپی شاخ

کەزی: پرچی درێژ، کە بۆ هۆنینەوە بشێ

کەڵەك: کەڵەس بەلەمێکە لە کوندەی پفدراو و دار دروست دەکرێ بۆ پەرینەوە لە ئاو

کەندر: گەوەڕ، لەغەم، کەندالێك بنەوەی ئاو دایدڕیبێ

کەوشەن: سنوور، سەرحەد/ کەوشەنبەزێن: سنووڕپەڕێن

کەوێڵ: کوختە، کۆخ، زنج، خانووچکەی یەکجاوە(بەتایبەتی لەناو ڕەز و باخدا)، ئەشکەوت

کەیل: پڕ، مشت، تژی

کێمردەلان: زەویی چەقۆڕێژ، عەردی بە کێرد و چەقۆ داچێندراو(بەردەلان، زیخەلان، بێشەلان، قامیشەلان...)

گ

گاتا: بریتییە لە سروودی زەردەشت خۆی، کە بە شیعر دانراوە، گاتاکان بەشێکن لە"یەسنا" کە یەکەم بەشی ئاڤێستایە

گازاندە: گلەیی، گلە، گازن

گازکردن: بانگ کردن

گازی پشت: کاریتەی پشت، تیرەقەی پشت، بڕبڕەی پشت

گرفە: کڵپە، نێڵە، لرفە، دەنگی بڵێسەی ئاگر

گرکان: بورکان، ئاگرپژێن، ئاگری

گزرە: ئێزینگ، دەستەوار، چینەدارێکی ئامادە بۆ سووتاندن

گۆپکە: پشکۆ، چرۆ، گۆی مەمك

گورگی باران دیدە: مەبەست لە کەسێکی بەئەزموون و دنیادیدەیە

گۆل: دەریاچە، زرێبار

گوڵبانگ: بانگ و خوێندنی جوان

گوڵبەدەم: زۆر ناسك(بەتایبەتی بۆ بەری بێستان بەکار دێ، کە هێشتا کوریکی پێوە مابێ)

گوڵبەژن: گوڵەندام، بەژنزراو، بەژنباریك

گوڵگوڵی: ڕەنگین، ڕەنگاوڕەنگ

گوللەبەند: بازیبەند، نووشتەیەکە لە قۆڵ دەبەسترێ بۆ ئەوەی گوللە کار لە هەڵگرەکەی نەکا

گوڵەستێرە: ئەستێرۆك، گوڵەئەستێرە، گووئەستێرە، کۆسارە،

گۆستێر، گیاندارێکی بچووکە شەوان دەدرەوشێتەوە

گۆڵەی هەور: هەورەتریشقە، گرمەی هەور

گولی: خۆرە، دووزامی، گەڕی، پیسکی، گوڕییەتی

گومبەت: کومبەز، گونبەت، قوببە

گوێڕایەڵ: کوێلەمست، بەقسەکەر، کوێدێر

گوێلەمست: گوێڕایەڵ، بەقسەکەر، گوێدێر

گەرداو: گەراڤ، گەرداڤ، ڕەشەبای دەریا

گەردنکێل: گەردن بڵند، گەردن جوان و شوش

گەردوگوڵی بەیانی: گزنگی بەیانی، کازیوە، بەیانی زوو

گەمیە: کەشتی، پاپۆڕ

گەو: ئەڵقە، بازنە

گەوز: تل/ گەوزدان: تلدان، تلخواردن، گەوزین

گێژخواردن: گێجخواردن، خولخواردن بە دەوری خۆدا

گێژاو: گێژەن، گەڕی ئاو، شوێنی بە دەوری خۆداخولخواردنەوەی ئاو

گێژەن: گێژاو، شوێنی خولخواردنەوەی ئاو لە ڕووباران

ل

لاپاڵ: قەدی شاخوداخ و گرد و زورگ و هەڵەت

لاك: کەلاك، لاشەی مردار، جەندەکی چوارپێی مردار

لاکێش: کە نارە، موستەتیل، درێژکۆلە

لێ: بەڵام، ئەمما

لێڕ: دارستان، جەنگەڵ، لێڕەوار، مێشە

لێوە: شێت، دین، دێوانە، ئاپتەر

م

ماخۆ: خاوەن، خودان، خێو، ساحێب

ماڵیژگە: ماڵێکی خنجیلە و بچووك

مجرۆ: نابینا، کوێر، کۆرە

ملەقوتە: سەرەتاتکێکردنی گیاندار

مۆتە: مۆتەکە، مێردەزمە، سرنجك، کابووس

مۆرد: مۆرتك مورتك

مەخمەری: مەخمەڵی، قەدیفەیی

مەکۆ: حەشارگە، ڕوانگە، مەڵبەند، کۆگە

مەفتەن: زێد، نیشتمان

مەودابەزێن: ئەوی بەسەر مەودا(مەسافە)دا زاڵە

میرغەزەب: سەربڕ، جەللاد

ن

نژدە: ملەزەن، گۆران، ڕێگر، چەتە، دەستەی ڕێگران

نووچدان: ڕەتبردن، ساتمەکردن، هەڵەنگووتن، نسکۆهێنان

نووسکە: نووزە، نووزانەوە، کرووزانەوە، قرووسکە

نۆما: جوانوو(جانی)ی دووساڵە، جوانە هەسپ و ماینی دووساڵە

نەخشبەند: نیگارکێش، هونەرمەندی شێوەکار

نەرمەپێل:شەپۆلی ئارام و گچکە

نەستەلژی(کریکی): تاسەی نیشتمان، سۆزی غوربەت

نەوخیزە: گیای ناسکی تازە شینبوو، گوڵی تازەپشکووتوو

نێڵە: هێڵە، گرفە، کڵپە، لرفە، دەنگی هاڵاوی ئاگر

و

ورشە: گرشە، درەوشانەوە، بریقە

وردەپێل: وردە شەپۆل

ورینگە: ورنگ، دەنگی نەرم و لەبەرگوێ شیرین، زەمزەمە، گۆرانیی سەبرۆکەی لەبەرخۆوە

وەگیرهێنان: دەستگیرکردن، گرتن، بەرزەفت کردن، پەیداکردن، بەدەستهێنان

وەلانان: بەلاوەنان، لادان، پشتگوێخستن

٥

هاتەهات: دەنگۆ، قسەو قسەڵۆك

هاوێرکردن: لێك جوودا کردنەوە، لێکدابڕین(بەتایبەتی کار و بەرخ لە پەز)

هزر: بیر

هۆبە: ئۆبە، هۆب، کۆمار، کۆمەڵەڕەشماڵێکی پێکەوە هەڵدراو.

هەژمەت: سویْ، داخ، حەسرەت

هەش: خم، خوم/ هەشبەسەر: بەدبەخت، کلۆڵ

هەڵکورمان: خۆگرمۆڵەکردن، خۆکلۆڵەکردن

هەنیە: هەنی، ئەنی، ناوچەوان، تەوێڵ، پێشانی

هەودا: تاڵ، دەزوو، داو

هەوك: ئەوك، قورگ، قرگ، هەفك، گەروو، بین، قورقوراگە

هەیوەشەو: هەیڤەشەو، مانگەشەو

هێما: ئاماژە، نیشارە

هیمداد: هانا، فریا/ بگەنە هیمداد: فریاکەون

**سەرچاوە:**

بەرەو زەردەپەڕ، عەبدوڵڵا پەشێو، چاپی یەکەم، سوید(٢٠٠١).



# لەدایکبوونی سەرکۆمارێک

سەدەی سێزدەم بوو
کاتێ... هۆلاکۆ
بەکوردستاندا وەك پەتا ڕەت بوو.
ئەوساش، وەك ئێستا،
سەردەمی تەکیە و دەف و گومبەت بوو.
بەژنی تێریمان هێندەی پنجەنۆك،
منارە ئاسا خەم کەڵەگەت بوو.
کە بەغدای ئەنگاوت،
کاتێ میحرابی بۆ هەسپەکەی خۆی کردە تەویلە،
کاتێ قەڵغان و ڕمبی هەڵپەسارد-
جادووبازێکی گۆڕستاننشین
هێلکەمارێکی بە دیاری بۆ نارد.
دێڵە گورگێکی هاری هۆلاکۆ
لە کەندرێکی شێدار و تاردا لەسەری وەرکەوت،
لەسەدەی بیستەم هێلکە ترووکا:
سەری بەدوومی ئەژدیها دەرکەوت!

١٠-٣-١٩٨٩

تەرابلوس

## ژن

(١)

بەبینینت
من دەبمەوە بنیادەمی چاخی بەردین،
دەچمەوە ناو ئەشکەوتی تار، جەنگەڵی چڕ،
گوێ شل دەکەم بۆ برووسکە و
گڕەی هەور و بارانی خوڕ،
شارستانیی دوگمە و وایەر بزر دەبێ،
ئاتەشگەکان پڕ دەبنەوە لە پێت و گڕ.

(٢)

چیت مەرام بێ، دەچێتەسەر:
تۆ دەتوانیت، بە نیگایەك،
سەوزەڵانێك بە ڕووتەن کەی.
لە دەستت دێ، بە هێمایەك،
بەردەڵانێك بە چیمەن کەی.
چیت مەرام بێ، دەچێتە سەر:
تۆ دەتوانیت
باڵی زمانم ببەستی و
درەختی پەنجەم بێبەرکەی.
لە دەستت دێ
چەمی دەنگم تژی ماسی و
هەر پەیڤێکم پڕ گەوهەر کەی.
تۆ دەتوانیت... بمکەیتە کۆیلەی مل بە تۆق.
لەدەستت دێ... تاجی سەروەریم لەسەرکەی.

(٣)

لەبن کۆمەی خۆڵەمێشدا-
تۆ ژیلەمۆی گەشی خولیای.
لە گێژەنی تاریکیدا-
تۆ بریسکەی بەفری چیای.
لە بیابانا- هاژەی چەم و
لە نەهاتا- هەڵمی نان و
لە غوربەتا- داڵدە و پەنای:
کلیلداری بەهەشتی تۆ.
تۆ نەك نیوە: هەموو دنیای!

٢٨-١١-١٩٨٥

تەرابلوس

## هەڵەبجە

(١)

پێم سەیر نییە، گەر لێرە و لەوێ،
(لە کرێمل بێ یا کۆشکی سپی)
چاوم بە هەندێك بنیادەم کەوێ،
لەباتی ددان- کەڵبەیان هەبێ.
لەباتی نینۆك- ڕنۆکیان هەبێ.
ئەوەی پێم سەیرە، وەکوو پەرجۆی خوا،
هەڵەبجەخنکێن
دووچاوی هەبێ و بە دووپێ بڕوا!

١٩٨٩/٤/١٤

تەرابلوس

(٢)

لە سوێی هەزاران
زیرەو چریکەی لە هەوکا قەتیس،
لە سوێی هەزاران
پرسی باڵگرتوو بەرەو عەرشی خوا،
کە داوەرین و خنکان لە ڕێدا-
شەو و ڕۆژ ئۆقرەم لێ هەڵگیراوە،
سوکناییم نایێ.. چ بە بێداری، چ لە ناو جێدا،
دەپرسم، دەڵێم، لەعنەت لە کێ کەم:
شەیتان، یا ئەوەی فیکەکەی لێدا؟

١٨-٩-١٩٩٣

مۆسکۆ

## بۆ هادی عەلەوی*

تۆ، لە سەردەمی کورتەباڵایان،
باڵای بەرزی خۆت لەکوێ هێناوە؟
تۆ، لە سەردەمی قاتی و نەهاتا،
وەرزی سەوزی خۆت لە کوێ هێناوە؟
لەبەر خرینگەی
شیر و... زرینگەی
ئاڵتوونی قورەیش
چۆن گوێت لە ناڵە و نرکەی عەلی بوو؟
چۆن لەبەر ژاوەی ئایشە و حەفسان
گوێت لە سکاڵای ماریەی قیبتی بوو؟

. . .

خۆ سەدەکانی ئێمە هەموویان
لکی درەختی چاخی جاهیلین:
کڵێسە و مزگەوت،
شوورا و پەرلەمان،
بارەگا و دیوان،
هەموو بازاڕی گەرمی عوکازن...
نابیغەکانیش هەمان نابیغەن:
خودایان ورگە... ئەوەی بەرازن،
لەملا بەرزگی شای غەساسینە باوەشێن دەکەن،
لەولا بۆ بنپێی شای مەنازیرە وەك بەردەبازن.

. . .

لە ڕۆژهەڵاتی ڕۆژ لەبن پێدا،

لەڕۆژهەڵاتی
دەستنوێژ هەڵگرتن بەخوێن و پێترۆڵ،
لە ڕۆژهەڵاتی
مارەبەجاش و
ڕشك و ئەسپێدا،
لەو ڕۆژهەڵاتەی
نامووس فیرارە و
پەنابەرێکە لە ناو دەرپێدا:
سەرم سوڕماوە،
چۆن توانیت، گەورەم!
بێدەنگی قانگ دەی؟
تۆچۆن زاتت کرد
ئەو کوولەکەیە بدەی بە عەردا و
پڕ بە دەنگ بانگ دەی!
ئەی ڕۆژهەڵاتی کورتەباڵایان،
ئەم باڵا بەرزەت سەدجار پیرۆزبێ.
ئەی چاخی قاتی و ساڵانی نەهات،
ئەم وەرزە سەوزەت سەدجار پیرۆزبێ!

١٩٩٠-١٢-٢

مۆسکۆ- ستارەمینسکایا

## پەراوێز:

هادی عەلەوی: بیرمەندێکی عیراقییە و یەکێکە لەو نووسەرە دەگمەنانەی عەرەب، کە لە هەڕمەتی شەهیدکردنی هەڵەبجە حاشای لە ناسنامەی عەرەبایەتیی خۆی کرد و سەربەخۆیی کوردستانی بە ڕەوا زانی.
ئایشە: کچی ئەبوبەکر، خیزانی پێغەمبەر(د).
حەفسە: کچی عومەری کوڕی خەتتاب و خێزانی پێغەمبەر(د).
مارییەی قیبتی: کچێکی کۆیلە بوو، لە میسرەوە بە دیاری بۆ پێغەمبەر هات و کردییە هاوسەری خۆی.
عوکاز: بازاڕێکی عەرەبان بوو، سەکۆیەکیش بوو بۆ پێشبڕکێی شاعیران.
نابیغە زوبیانی: شاعیرێکی عەرەبی سەردەمی جاهیلیبوو، کێزێتری دابا، بەویدا هەڵدەگوت. لە نیوان شای مەنازیرەو شای غەساسینەدا، کە دوژمن بوون، لە هاتوچۆدا بوو. ڕەمزی شاعیری خوێڕی و فرەناخوڕە.

## ئۆتەقەردان

هەر جارێکبوو،
نیگاکانمان
لێك گیربوون وەك چنگی بازان.
هەر تاوێکبوو،
پشتمان تێك کرد،
ڕێگەکانمان لێك ترازان.
لەو ڕۆژەوە
بە دارمێوی خەیاڵمەوە
ئاوێزانی
وەك جوانترین هێشوەترێ.
پەیتا پەیتا...
تەرزی بیرم تێت دەئاڵێ و
لە دەورت دەبێتە گرێ.

. . .

ماوەیەکە
ڕێی جارانی خۆم گۆڕیوە،
نەوەك ڕۆژێك...
تووشت بێم و شێوەم نەکەی،
نەوەك ئێستا...
لە گێژەنی یادی تۆدا
ونتر بم لە بەردی بنگۆم،
ئاخ! دەترسم، ئێوارەیەك،
بە زریانی نیگای ساردت
هەڵوەرێنی گۆپکە و چرۆم،
لەو بەهەشتەم وەدەرێنێی
کە دەزانم هی من نییە،
بەڵام کردوومە بە هی خۆم!

١٩٩١-١٢-٢٧

مۆسکۆ

## دەسەڵات

قەڵەمەکەم چەکوچەو
هەر پەیڤێکم- بزمار.
ستەم لە هەر جێیەك بێ،
دەیسمم وەك تەختەدار!

١٩٩٣-٨-٢١

مۆسکۆ

## مۆنۆلۆگ

کازێوەیە.
سەرینی تۆ باسکی منە،
سەری منیش
لەسەر باڵی کرێوەیە.
کازێوەیە.
پۆلێك پرسیار بەڕێ دەکەم،
پۆلێکی تر بەڕێوەیە.
کازێوەیە.
گا ئازیزێك، کە زیندووە،
لە ناو تابووت ڕاکشاوە و
شەلاڵی زەردەچێوەیە
گا هاوڕێیەك، کە نێژراوە،
چاوی زەق زەق تێم بڕیوە و بەپێوەیە!

. . .

هەنووکانە چاو لێك دەنێم...
ئەو دەلاقەیە دادەخەم
کە ڕابردووی لێوە دیارە،
شاباڵی ئەو بازەش دەکەم
کە لە فەزای ئایندەدا
سەرگەرمی ڕاو وشکارە،
من تێدەگەم:
ئەوەی ڕابرد- وەگیر نایێ،
ئەوەی دادێ- هەر مردنە...
هێندەم بەسە،
کە تۆ... ئێستا...
سەرت لەسەر باسکی منە.

. . .

دەڵێم، گەر دایەحەوا
گوێڕایەڵی خودا با،
بەری حەرامی دیبا و
قەپاڵی لێ نەدابا...
کوا، کێ دەڵێ، من و تۆ
لەوێش من و تۆ دەبووین؟
کێ دەڵێ، گەمیەی بازووم
سەرتی لەسەر پێڵی شەو ڕادەژەنی
هەنووکە؟
کێ دەڵێ، لەو بەهەشتا،
بەهەشتۆکەیەك دەبوو،
هەر من و تۆی تێدا بێ

وەك ئەم لانە بچووکە؟!

٨-١٠-١٩٩٣

مۆسکۆ

## دوودڵی

نیوەشەوێ،
لەبن ڕێژنەی
هەودای تەزوو و برووسکەدا
ژوانم هەیە.
کە دەیگەمێ،
لەپی دەستێك بۆ ناو تۆفان گەمیەم دەبێ.
بەژنێك شیعر و تریفە و بۆن تێم دەئاڵێ،
کۆشێك داڵدەی هەنیەم دەبێ.
بۆ دوودڵم؟!
ئەگەر نەچم،
کێ دەزانێ،
لەم عومرە کورتەی کە ماوە،
کەنگی دیسان ژوانم دەبێ؟!
کێ دەزانێ،
کەی شێتی باڵم پێ دەگرێ و
جارێکی تر
دەرفەتی سووتانم دەبێ؟!

١٣-١٠-١٩٩٣

مۆسکۆ

## لێکدابڕان

ئێوارە بێ، یا کازێوە،
خۆرەتاو بێ، یا شڵێوە،
لەهەر کوێ بێت:
لە ناو کونە ئەشکەوتێکا،
یا شارێکی پڕ هاتە هات،
لە کونجێکی تاراوگەدا
یازنجێکی کاولەوڵات،
هەر کاتێکی مەیلت لێ بێ،
من دەبمە با و بە چرکەیەك دەگەمە لات.
تۆ هیچ نا، هەر هێندە بکە،
بڕۆ، درەختێك ڕاسپێرە،
چۆلەکە دەورەیان دابێ.
بڕۆ، جۆگەییێك ڕاسپێرە،
پەیکی پێڵی بەئاگا بێ.

١٣-١٢-١٩٩٣

مۆسکۆ

## ئەدرەسی خۆمت دەدەمێ

بەڵام ڕچە قەت نەشکێنیت.
ڕێگەی جێژوان گوڵڕێژ دەکەم-
بەڵام نەکەی بێیتە ژوانم.
بەیداخی سپی هەڵدەکەم-
دڵت بەرد بێ!
گوێ نەدەیتە چۆکدادانم.
گرمەم دێ و چەخماخە دەدەم-
خۆت نەبان کە... لە ڕەهێڵەم... لە زریانم.
ئەگەر زۆر زۆر بیرت کردم،
جارجار وەرە بن ساباتی خەونەکانم!

١٤-١٠-١٩٩٦

هێلسنکی

# چەند نموونەیەکی تر لە شیعرەکانی پەشێو

## ئەو ئەبینم

(١)

نەخێر، هەرگیز باوەڕ ناکەم
چرکەیەك بێ تۆ ژیانم.
ڕێی تێ ناچێ،
بێ کووژەکەی دلۆڤانیت،
بەدۆزەخی ئەم عومرەدا
ڕەت بووبم و هێشتا مابم!
کە مندالْ بووم،
گەر تۆ دەستت نەگرتبام،
چۆن دەمتوانی پێڕەوکەبم؟
درەنگتریش،
بۆ تۆ نەبا،
من کەپرۆکەم بۆکێ دەکرد لە چیلکەدار؟
بۆ وەك نۆما،
بەپێی پەتی،
دەشتم تەی دەکرد سەروخوار؟
ئەگەر شیعریش
ئادگاری وەك تۆ نەبایە...
وەك تۆ نەبایە کتومت،
چۆن ئەو هەموو باڵدارانە
دادەبارینە سەر زمان؟
چۆن یەکەم دێڕ شیعرم دەگوت؟!
نەخێر، هەرگیز باوەڕ ناکەم
چرکەیەك بێ تۆ ژیابم
دەتناسمەوە:
لە تۆفانی شەستوسێدا
تۆ بووی... شەوێك
بەرەو شاخ بووی بە ڕێنمام...
تۆ بووی لە ناو ئەڵقەی گڕدا
شیعرەکانت چەپاڵە دام.
تۆ بووی خەونت بۆ زین کردم،
ڕەشمەی برووسکەت لە مست نام.
دەتناسمەوە:
هەر جارێکی کەوشەنێکم پەڕاندبێ،
لەگەڵما بووی هەنگاو هەنگاو.
تۆ بووی مۆتەی ترست دەکوشت،
دنەت دەدام بۆ ناو ئاگر، بۆ ناو گەرداو.
دەتناسمەوە:
لەهەر جێیەك گرماندبم،
تۆ چەخماخە و گەواڵە بووی
لە سەرمدا.
ئەتۆ کالأی
ئاودامانی گوڵلەبەند بووی
لە بەرمدا.
نەخێر، هەرگیز باوەڕ ناکەم
چرکەیەك بێ تۆ ژیابم.
ڕێی تێ ناچێ،
بێ کووژەکەی دلۆڤانیت،
بەدۆزەخی ئەم عومرەدا
ڕەت بووبم و هێشتا مابم!

(٢)

من پێش تۆ هاتمە دنیا...
تاگیانی خۆم تەیار کەم
بۆ گۆڤەندی ژوانی تۆ
تا بێتۆیی بچێژم،
هەر ساتێکی بینینت
بۆ من ببێتە پەرجۆ

. . .

من پێش تۆ هاتمە دنیا:
تا عومری گوڵ درێژتر،
گڕی ئاگر پەتیتر،
تەمی خەم تەنکتر کەم
تا فێر بم، بە ئاسانی،
لەسەر سنگت سەوزبم،
تۆ لە خۆمدا بزرکەم!

. . .

من پێش تۆ هاتمە دنیا
تا وابکەم کارماز
چیدی نەسەنگرێنەوە
لە ئاوایی و دەراوان.
تا وابکەم تەیروتوار
جێی چینەیان ناو لەپ بێو
نەکەونە تەپکە و داوان.

. . .

من پێش تۆ هاتمە دنیا:
تا بتوانم، ئازیزم،
هەرکاتێ ئارەزووکەی،
ئەستێران وەك مۆم پێکەم،
لە تووکی نەرمی مەلان
جێژوانێکت بۆچێکەم.

. . .

من پێش تۆ هاتمە دنیا:

تاچاوی خۆم ڕابێنم،
لە تۆفانی ڕەنگاندا
ئادگارت هاوێر بکا.
تا گوێچکەی خۆم فێر بکەم،
لە باهۆزی دەنگاندا
سرتەت گوڵبژێر بکا.

. . .

من پێش تۆ هاتمە دنیا:
تا بۆ نۆتەی لەشی تۆ
مووبەمووم هەمووی ژێ بێ.
تا شایانی ئەوەبم،
کلیلی تەخت و تاجی
خۆشەویستیی تۆم پێبێ!

١٩٩٦-١٠-٢٩

هێلسنکی

## تاسە

پەلەقاژەمە!
بەڵکوو تا زووە،
هەندێ گەڵای دار،
هەندێ پنجەگیا و گوڵەکێویلەی
ئەوێ دەسگیرکەم.
ناترسم ناویان لە یادم بچێ،
بەڵام دەترسم... بۆنیان لە بیرکەم!

١٩٩٨/٣/٣٠

هیلسنکی

بۆ بۆنێکی خواکرد شێت بووم!
"تەنیا لەوێ
هەر کولیلکێك شووشە بۆنی سەروالأیە."

١٩٩٩-٢-٢٦

هێلسنکی

## خەڵات

ژینێکی ترم خەڵات کە، خوایە!
باکورت بێ وەك هی گوڵ و پەروانە.
بەهەر بستێ عەرد من قنیات دەکەم،
بەڵام تیا نەژیم وەکوو بێگانە!

١١-٤-١٩٩٩

هێلسنکی

## پیرێ

کاتێ، جاران،
تەمی خەمێك، لەسەد پێچ و کەنارەوە،
شەپۆل شەپۆل، قەف قەف دەهات،
دایدەگرتم بە ترۆپك و بنارەوە:
بیرم لەوە دەکردەوە،
کەسەودایەك، عیشقێکی نوێ..
سبەی بەداری عومرەوە
گۆپکە دەکا و دەپشکۆی.
کەچی ئێستا،
کە دڵتەنگی قانگم دەدا،
کە دەبینم ئێجگار ماتم-
بیر لە جوانێك دەکەمەوە،
کە فلأن ساڵ،
لە فیسار جێ تووشی هاتم!

١٩٩٩/٥/٣

هێلسنکی

## شیعر و تاج

کەسەر بە شانم دەکەی- شای وڵاتی پەرییانم.
کە گڕ دەگری و دەتۆرێی- شاعیری خەم و ژانم.
ئەگەرچی تاج و شیعر، وەتی دنیا دنیایە،
چەشنی ڕەشەبا و مۆمن،
بەڵام، دلەگۆڕکێت خۆش، هەردووك لەبن ڕکێفمان،
بەجووتە دەستەمۆمن!

١٩٩٩/٩/٩

هێلسنکی

## ڕازێك

من، دووساڵە
سەوداسەری درەختێکم،
کە جێی پشت پەنجەرەی منە.
سەد جاریش خۆی گەڵاپۆش کا،

من بە ڕووتی ئەو دەبینم:
درەختی چی؟! شۆڕە ژنە!
بەڵام چەند دەکەم تێناگەم،
کە بەهاران
شیرینەکەم ژان دەیگرێ و چرۆ دەکا،
کە پایزان
جگەرگۆشەی دادەوەرن لەبەر بادا،
کە شەوگاران
کرێوەیەک دەزریکێنێ و
هاودەنگ قاتە لە دنیادا-
خۆ من چرام تا بەیانی هەر دەسووتێ،
بۆچی جارێک لە پەنجەرەی ڕۆشنام نادا؟!
١٩٩٩/٩/١٠
هێلسنکی

# شەفەق لەژمەردە پەیدا

(١)

بەمناڵی
شێتی کچەهاوسێیەک بووم:
ئەگەر ڕۆژێک نەمدیبایە،
کفرم دەکرد،
وام دەزانی
عەرشی ئاسمان بێ خودایە،
ئەگەر ڕۆژێک ناوی منی نەهێنایە،
وام دەزانی
چیدی کێشکە چینە ناکەن لە پەساران،
پەڕەسێلکە ناسریوێنن،
خۆر هەڵنایێ لە جێی جاران.

. . .

بە مناڵی
شێتی کچەهاوسێیەک بووم...
هەرجارێکی وەڕس دەبووین،
سەری خۆمان هەڵدەگرت و
لەشوێنێک، چەپەک و پەنا،
خانووچکەیەکمان چێ دەکرد،
ماڵیژگەیەکمان دادەنا:
هەرزاڵەیەک بۆ پێخەف و
کەندوولەیەک بۆ ئازووخە و
گۆزەڵەیەک بۆ سەر کانیاو.
هەر جارێکیش برسی دەبووین،
داردەستێکم زین دەکرد و دەچوومە ڕاو!
تا من لەوسەر دەهاتمەوە،
قوڕ دەکرایە زمانەگا و
دەبرژێنرا لە بەرهەتاو!

. . .

بۆ ئەو کچە دراوسێیە
سەرتاسەری دنیا گەڕام:
لە وێستگەی شەمەندەفەران،
لە فرگەکانی هەندەران،
لە مەیخانە و پەرستگاکان،
لە هەموو دەریا و بەندەران...
چاوم گێڕا،
بێ هوودە بوو!
نەمدیتەوە و نەمدیتەوە.
زۆرجار دەهات لە بیری کەم،
کەچی لەپڕ دەیتروسکاند
ژیلەمۆی بن خۆڵەکەوە.

(٢)

هەر ئەو شەوەی بۆ یەکەم جار
ستێرێکی چاونماویی قوتبی باکوور
بۆمان بووە قیبلەنمای یەکەم دیدار،
بەچرکەیەک مەودا سووتا، دیوار ڕمان،
سەرتاپامان بوو بە نیگا،
موو بە موومان بوو بە زمان.
دیتت چ زوو
هەردوو باڵت لە من ئاڵاند؟
دیتت چ زوو
سەری سپیم سنگی تۆی کرد بە نیشتمان؟
هەر ئەو ساتە،
هەر ئەو شەوە،
گڕفەی هات و گڕی هەڵسا
ژیلەمۆی بن خۆڵەکەوە.
هەر ئەو ساتە،
هەر ئەو شەوە،
تێگەیشتم،
جوودایی من و هاوسێکەم
درۆیە، مۆتەیە، خەوە:
ڕوو هەمان ڕوو
دەنگ هەمان دەنگ
بۆنت هەمان بۆنی ئەوە!

١٩٩٩/٤/٢٨
هێلسنکی

## هۆنراوەیەکی ناتەواو

هەر بە وشە
نیگارێکی ئازیزەکەی خۆم کێشاوە.
سەیری دەکەم:
دەق خۆیەتی!
هەر بۆ گوێیە تەنکەکانی
گوارە ماوە.

. . .

فەرهەنگەکان
بابە خۆیان هەر بنازن،
با بپرسکێن
با بخەملێن بە هەزاران وشەی بەدەو.
بە چی دەچن،
کە پەیڤێکیان تێدا نەبێ،
بشێ ببێ بە گوارەی ئەو!

. . .

من ئەییووبم.
بە ئاسانی پشتی ئومێدم ناچەمێ.
وشەیەکە و عەودالیمە،
زوو یا درەنگ هەر دەیگەمێ-
لەسەر باڵی سیمرخیش بێت،
ئاسمان بست بست دەپشکنم.
بە زەویشدا بچێتە خوار،
بنزەویگەڕ هەبێ منم.
وشەیەکە و دەیدۆزمەوە،
ئەگەر بنپێی خەیاڵیشم
شەقشەق و پارەپارە بێ.
گەر هەر نەبوو،
دایدەتاشم!
ناهێڵم گوێی ئازیزەکەم بێ گوارەبێ!

١٩٩٩/١٢/٢٠

یوتوبوری

## هەڵچوون

ساردیت دەمکوژێ. دنیا پایزە و
بەدەنی منیش ڕووتترین خاکە
هاوینی تینوو لە ناخمدایە،
نمەی خوناوکە لێوم تەڕ ناکا.
دە بتریشقێنە، هەوری شاقەلشۆڕ!
دە بیرووسکێنە... ببارە... داکە.

## ئەلها

لەو شەوەوە سەرینێك
سەراپای نوقم کردم
لە گێژاوی شەوبۆدا-
وەکوو چرکەژمێرێك،
بیرم هەروا خول دەخوا
بە دەوری بەژنی تۆدا!

٢٠٠٠/١٢/١٠

هێلسنکی

## پێڵاو

جووتێك پێڵاوی ڕەشم لە پێیە:
پینەدار، هەرزان، گەمار، سووك، گلاو،
هەزارجار ئەم پێ و ئەوپێ... پێ کراو.
چەند جاری کەوا سەرنجیان دەدەم،
بەدەست خۆم نییە، لموزی پێڵاو
قەپۆزی هەندێ
سەرکردەی کوردم دێنێتە بەرچاو

١٩٨٢/٥/١١

مۆسکۆ

## مردن

ئەوەی دنیا جێدێڵێ،
سوارە و ئەسپ تاو دەدا،
زینە جێگەی مردنی،
ڕەتبردن و گلانی
چۆن بوو، هەروا دەمێنێ
لەلای دۆست و دوژمنی.

. . .

مردن! مادام تۆ هەر دێی،
ڕۆژێکی ئاوا وەرە،
خۆم بۆ لات بەرێوەبم.
ڕۆژێکی ئاوا وەرە،
گرم دانەمرکابێ،
سەربەرز و بەپێوەبم!

١٩٨٢/٥/٧

مۆسکۆ

## گەنجی و پیری

هەر چەند دەکەم، گەنجی و پیری
لەیەك جودا ناکەمەوە.
من هەردووکیان دەپەرستم:
بەیانییان ڕووەو شەفەق،
ئێوارانیش ڕووە و زەردە
سەرسام و ملکەچ دەوەستم!

١٩٨٢/٥/١٥
مۆسکۆ

## گەلگەلە

ئەمشەو مەستم
ئەمشەو گێژم،
ئەمشەو کاسم-
لەسەر تەختی سەری یاخیم
ژنێك تاجی لەسەر ناوە... کە نایناسم!

١٩٨٣/٤/٨-٧
مۆسکۆ

## تا چرای ئێمە نەسووتێ

(ئەو گەلەی گەلێکی تر دەچەوسێنێتەوە خۆی ناحەسێتەوە)
"بیرمەندێك"

تا چرای ئێمە نەسووتێ
ئێوە هەرگیز ڕووناکایی
نابینن بە چاوی خۆتان.
تا ئێمە دیل و کۆیلە بین،
هەر کۆت و نیر،
تۆق و زنجیر دەکەین بۆتان!
قڕمان دەکەن؟
قوڕتان بەسەر!
گەر بشمرین
تەنیا دیلی دەدۆڕێنین،
چ هەیە لە دیلی تاڵتر؟
گەر بشمرین هەر سەرکەوتووین،
کوا لە کۆیلەی شەهید زاڵتر؟
. . .
قڕمان دەکەن؟
قوڕتان بەسەر!
دوای مردنیش،
لێ ناگەڕێین
نیشتمانمان بکەن بە ماڵ.
لێ ناگەڕێین
گۆشتمان بخۆن وەك قەل و داڵ.
گەر هیچ نەبێ
دەبینە خاڵۆزەی بێستان،
زیوانی ناو دەغڵ و دانتان.
دەبینە لم،
دەچینە ناو پارووی نانتان.
دەبینە مار،
پەپکە دەخۆین لە ناو نوێنتان.
دەبینە شێرپەنجە و مێکرۆب،
گەرا دەخەین لەناو خوێنتان.
دەبینە کوان،
هەردەمەو لە جێیەك دەردێین.
دەبینە ژان،
لە سەد لاوە تێتان وەردێین.
دەبینە زێرووی هەزارپێ،
دەم گیر دەکەین لە گەرووتان.
دەبینە تامیسکەی سەر لێو،
باپشکێوی سەر پێڵووتان.
قڕمان دەکەن؟
قوڕتان بەسەر!
دوای مردنیش،
لێ ناگەڕێین
نیشتمانمان بکەن بە ماڵ.
لێ ناگەڕێین
گۆشتمان بخۆن وەك قەل و داڵ.
گەر هیچ نەبێ
شەوان دەبین بە تارمایی و مێردەزمە،
وەکوو گەڵا دادەوەرین.
بە یانییان
دەبینە ڕووبەندی ئاسۆ،
بەری گزنگی خۆر دەگرین.
قڕمان دەکەن؟
قوڕتان بەسەر!
شایی بکەن-
دەیکەین بەشین.

پرسە دانێن-
کاستان دەکەین بە پێکەنین!
دەبینە لەکەی زمان و
تانەی سەرچاو،
دەبینە مووی ناو خۆراك و
خڵتەی ناو ئاو!
تا چرای ئێمە نەسووتێ،
ئێوە هەرگیز ڕووناکایی
نابینن بە چاوی خۆتان.
تائێمە دیل و کۆیلە بین،
هەر کۆت و نیر،
تۆق و زنجیر دەکەین بۆتان!

١٩٨٣/٧/٢

مۆسکۆ

## چلچرا و مۆم

هەیە پێش نووسین،
چلچرایەکی شاکاری دەوێ،
بۆ دۆزینەوەی ڕێی دڵی سوڵتان.
هەیە پێش نووسین،
بنەمۆمێکی ساکاری دەوێ،
بۆ خۆبینین و گڕ لە خۆبەردان.
بۆیە، پێش ئەوەی
قامك درێژکەم بۆ قەڵەمی خۆم،
تەماشا دەکەم،
کامیان دەسووتێ:
چلچرا یا مۆم!

١٩٨٤/٨/١٢

مۆسکۆ

## تۆ دڵتەنگی...

تۆ- دڵتەنگی
بۆ بێوەژن،
بۆ بێوەمێرد،
بۆ ئەو کۆرپانەی بێبابن...
منیش لە تۆ دڵتەنگترم
بۆ ئەو پەری و سوارچاکانەی
ساڵەهایە لەداك نابن!

١٩٨٦-١١-١٦

تەرابلوس

## لە دایکبوون

گوێم لە هاواری نەتەوەکەمە...
بەڵام دڵنیام
جیهانی سبەی گوشاد و ڕوونە:
لەدایکبوونی مناڵم دیوە-
قیڕە و لینگکوتان
یەکەم نیشانەی لەدایکبوونە!

١٩٨٧/٥/٢٠

تەرابلوس

## بۆ ئینتەرناسیۆنالیستێك

"بۆ هاوڕێی سەلڤادۆریم خۆسێ ڕۆمیرۆس"

سەرکۆنەم مەکە!
منیش، وەکوو تۆ، گۆی زەوی ماڵمە.
ئاسمانیش تافتەی کچی خەیاڵمە.
وەك تۆ خواکردم،
وەك تۆش دەمەوێ، تاسەر خواکرد بم.
بۆیە سەربەندی شیعرم هەر کوردە،
چونکە کوردم و نامێڵن کورد بم!

١٩٨٧-٥-٢٥

تەرابلوس

سەرچاوە:

برووسکە چاندن، عەبدوڵلا پەشێو، چاپی دووەم، کوردستان، هەولێر،(٢٠٠١)

# فەرهەنگۆك (٢)

ئـ

ئاخافتن: گفتوگۆ، قسەکردن، پەیڤین

ئاتەشکەدە: ئاگردانی پیرۆزی زەردەشتییان

ئادگار: سیما، بچم، قەلافەت، (ملامح)

ئاژانس(لاتینی): وەکالەت/ ئاژانسی دەنگوباس: وەکالەتی دەنگوباس ڕاگەیاندن

ئاورینگ: ئاورنگ، چریسك، پریشکی وردی ئاگر

ئەلها: ئارەزوو، کەڵکەڵە، مگێز

ئەنگۆرە: ئێوارەوەختی دوای ڕۆژئاوابوون

ئیدیا(گریکی): بیرۆکە، هزرۆکە، (فکرە)

ئیکسیر(عەرەبی): کیمیا، مایە، دەرمانێکە کانزا لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر دەگۆڕێ

ب

باپشکێو: سیچکەسلاوە، قینچکەسلاوە، بیتك

بادە: جامی مەی، کاسە، پیاڵە، پەیمانە

بازرەقە: دەرپەڕینی لەپڕی گیانداران یا فیچقە و فرکەکردنی شلەمەنی

باڵۆرە: جۆرە سترانێکی میللیی کوردیی تایبەت بە ژنانە

بالیف: باڵین، سەرین، باڵکە

بزرکاندن: قسە پەڕاندن، وڕێنە کردن

بژوێن: سەوزەلان، مێرگ، دەڤەری پڕ گیا و لەوەڕ

بنەوشیلە: بنەوشۆکە، بنەوشە، قەزوانێکی وردی مەیلەو نەرمی کەسکە

بوودڕ: ڕەهۆڵ، گەوەڕ، جێی دادڕاو لە زەوی

بولێل: بولێڵە، گوڕگومێش، تاریك و ڕوونی بەیانی یا ئێوارە

بەرزەفت کردن: گرتن، کۆنترۆڵکردن، خستنە ژێر ڕکێف

بەرۆك: یەخە، پێسیر، بەرچێڵە، زی

بەلەك: پووز، باق، لە کۆزینگەوە تا ئەژنۆ

بەندەخوێن: دۆخین

بێسەوادی: نەخوێندەواری، نەزانی، جەهالەت

بین: قورگ، گەروو، هەوك، ئەوك، حەفك، هەناسە، بێهن، پشوو

پ

پاساری: سواندۆکە، سواندولکە، جۆرێکە لەچۆلەکە، کێشکە، مەلیچك، چیچك

پرێسکە: پریاسکە، بۆخچۆکەیەك کە شتێکی کەموزۆر بە نرخی تێدا وەشاردرابێ

پلوورە: خلێف، خەلێف، کوورەی هەنگ، کەندووی مێشەهەنگ، ئەو شوێنەی هەنگ شانەی تێدا هەڵدەبەستێ

پۆرترێت(فەرەنسی): وێنەی کەسێك یا چەند کەسێك

پەتۆ: هەناسە، بێهن، پشوو

پەژمردە: چەرمسی، سیس، ژاکاو

پەنجەشێر: شێرپەنجە، تیراوێ، سەرەتان

پیرۆزە: پێرووژە، هوما، بەردێکی بە نرخی ڕەنگ ئاسمانییە

پێل: شەپۆل

ت

تاپۆ: تارملی، ڕەشانگ، سامۆتك

تافتە: دیوا، پارچە قوماشێکی ئاوریشمینی جوانی ژنانە

تاقچکە: تاقی بچووك، دەلاقە، ڕەفحە، تافە، ڕەفکەی ناو دیوار

تالووکە: پەلە، لەزوبەز، هەشتاو، دەستوبرد، جەخت

تامیسکە: تامیسك، تێمیسك، زیپکەی لچ و لێو

تانە: پەردەی سەر چاو

تریاك: تلیاك، ماددەیەکی بێهۆشکەرە

ترۆپك: تۆقەڵە، لووتکە، قوللە، دوند

تژی: پڕ، مشت، کەیل

تۆف: کریوە و سەرما و سایەقە

تۆقین: ترسانی زۆر، زراوچوون، زەندەقرژان، هەترەشچوون

تونێل: ڕەهەند، نەفەق، ڕێگەی ژێر زەمینی

توێ: توێژ، قەد، چین، لۆ

تەیمان: چەپەر، پەرژین، تانۆك، چیلە

تیریژ: تیشکی ڕۆژ، گزنگی خۆر

تیژیاڵ: مەلی خێرا لە فڕینا

تێژەنین: تێوەردان/ دەمیان تێژەنیوە: دەمیان تێوەرداوە

ج

جێژوان: ژوانگە، جێی پێکگەیشتنی دووکەس

چ

چاوم پێی هەڵنایێ: بەخیلیی پیدەبەم، ئێرەییی پێ دەبەم

چرکە: سێکوند، سات، چرکە سات، لەحزە

چزوو: باوەزیرك، درێشۆکە، نووکی بارێکی دووپشك و زەردەواڵە و هی تر بۆ پێوەدان

چلچرا: ئاوێزە(ثریا)

چەکەرە: چەقەرە، چووزەرە، نێرتکی تازەدەرچووی ڕوەك

خ

خالۆزە: خەڵووزە، نەخۆشییەکە تووشی بڕکی بێستان دەبێ.

خڕ: هەموو، گشت، تەڤ

خڕین: خڕکەڵە و گۆشتن و ڕۆحسووک

خزۆک: خزندە، خشۆک، ئەو گیانەوەرەی لەسەر زەوی دەخزێ(وەک مار)

خوان: سفرە

خورت: سەرکێش، بزۆز و غلوور(تایبەتیش هەسپ)

خوناو: خوناڤ، ئاونگ، شەونم، هەوان

خوناوکە: نەرمە بارانی پشك ورد

خەرەند: هەڵدێر، یا زەندۆڵ و قەڵشێکی قووڵ و ڕك و هەراو لە زەویدا(وەک هی ڕواندز)

خەزەڵ: گەڵای زەردی پایزان

خەمەگروو: خەمخۆک، قمقمۆک، سەرمازەڵە، کمکمو، گمگمە

خەوزڕان: خەوڕەوینەوە، دژخەوبوون

د

دلۆڤان: میهرەبان

دڵێژگە: دڵی بچکۆلانە(لەسەر قیاسی: کوڕ- کوڕیژگە، ماڵ- ماڵیژگە، خەم- خەمیژگە، پیاو- پیاویژگە...)

دوڕگە: کراڤ، جەزیرە

دوند: ترۆپکی چیا، قوتکە، قوللە، تۆقەڵە

دەوار: چادر، خێوەت، ڕەشماڵ

دەندە: پەراسوو

دێوجامە: دیجامە، پارچەیەکی ڕەنگاوڕەنگە بۆ ڕاوەکەو بەکاردێ

دیرۆک: مێژوو

ر

ڕام بوون: ماڵی بوون، کەوی بوون

ڕنۆک: جینجرۆک، چنگ، نینۆکی تیژی گیانەوەر

ڕۆحئەنگێو: ئەوەی گیان دەپێکێ

ڕۆندك: فرمێسك، هێستر، ئەشك، ئەسرین، ڕۆنتك

ڕەوەز: کەپکەشاخ، گابەردی زۆر گەورەی چینچینی کێو

ڕەهندە: عەودالْ، تەرە، تەرکەدنیا، مشەخت، دەربەدەر و ماڵبەکۆڵ

ز

زراوڕژان: زۆر ترسان، هەترەش چوون، زەندەق چوون

زراڤ: باریك(زێتر بۆ بەژنی ڕێك و شووش بە کاردێ)

زنار: تاشەبەرد، گابەرد، کەڤری گەلەك مەزن

زەریا: دەریا

زەل: پووش یا گیای وشك، قامیش

زەمزەمە: لەبەرخۆ گۆرانی گوتن، ورینگە ورینگ، ورینگاندن، بەزم و دەنگەدەنگ

زەندۆڵ: قڵێش و درزی زەوی

زەنگۆ: زەنگوو، ڕکێف، ئاوزەنگی/ زەنگۆڵێدە: ڕکێف لێدە.

زەنگۆڵ: تنۆك، دڵۆپ، پشك

زێروو: زەروو، زێلوو، هەزاپێ و مارەزیوی خوێنمژ

زیوان: زیڤان، زیزانە، دەنکێکی ڕەش و تاڵە لە ناوگەنمدا

س

سرك: ڕەوەك، سڵ

سفرە: خوان

سواڵەت: ئەشکەلکە، پارچەی دیزە و گۆزەی شکاو

سوپەر: قەلغان، مەتاڵ، سپێر

سۆتەك: سووتوو، سووتك، سووتەك، خۆڵەمێش(بەتایبەتی هی سیگار)

سووزەنەك: سوزاك، نەخۆشیی سەیەلان، گۆنۆری

سۆل: سۆلە، نەعل، کەوش

سونگی: نێزە، قەمە

سەرپشك: سەربەش، موخەییەر، خاوەن بڕیار لە هەڵبژاردندا

سینگ: سنگ، داری نووکتیژ بۆ داکوتان

ش

شابسك: بسکی سەرتۆپ، ئەگریجەی جوان، زوڵفی هەرە بەدەو

شادارستان: دارستانی زۆر لەوەند و ڕازاوە

شارۆچکە: شارەمێروو

شلك: ناسك، نەرموشل

شنینەوە: پێکەنینی مناڵی ساوا، لەرینەوە، شەکانەوە

شۆر: ئەڤین، دڵداری، عیشق، سەودا

شەفەق: شەبەق، یەکەم ڕووناکاییی هەتاو، گزنگی نۆبەرەی خۆر، ڕۆناهیی زووی لێواری ئاسۆ

شەقڵن: شەقەی لەهیکرای باڵی مەل و چەپڵە و شتیتر

شەمچە: کەلەشقارتە، دەنکەشقارتە، شقارتە، شخاتە، پێتك، نەفتك، گرتەك

شینکە: چیمەن، سەوزەڵان، گیاجاڕ، شینایی، زرچك

ف

فەڕەنگی: نەخۆشیی سفلس

ڤ

ڤەکردن: کردنەوە، وازکردن

ق

قاشۆ: چەوگان، دارشەق، گۆپاڵ، بۆ لێدانی گۆ لە گەمەی قاشۆیانی(هۆلێن، شەقێن)دا

قامك: پەنجە، ئەنگوست، تلی، پل، تیلك

قنیات كردن: قایل بوون، قەناعەتكردن

قورینگ: قولنگ، باڵندەیەكی قازناسای كێویی گەرمێن و كوێستانكەرە

قەپۆز: لە لووت بەرەژێری دەموچاو(تەنیا بۆ سووكایەتی پێكردن بۆ مرۆڤ بە كاردێ)

قەوزە: كرێژ، خوریەجنە، كەوز، كەوژ، كەز

ك

كاژەڵە: كاژەرە، كاسەسەر، قەحف، كاپێل، كاپێلك

كاژێر: شەویلاك، شەویلە

كتكەكوێرە: پشیلەكوێرە

كژ: وەرز، فەسڵی ساڵ

كرنووش بردن: سوژدە بردن

كوان: قونێر، دومەڵ، كولكە

كوتاڵ: كاڵا، قوماشی فرۆشتەنی

كۆتەڵ: كۆتل، هەسپێكە لە كاتی شیندا بە ئەسبابی مردووەوە دەیگێڕن

كوچك: بەردێكی لە خڕكە گەورەترە، كەڤرێك هێندە مەزن بێ، كە بۆ هاویشتن بشێ

كۆڤان: خەفەت، ئازار

كولم: كولمە، گۆنە، ڕوومەت

كونج: گۆشە، قوژبن، سووچ، قولینچك

كەڕەنا: شەیپووری مەزن، ئامرازێكی بۆرییناسای موزیكە

كەڤر: بەرد

كەنكەڵە: خولیا، خەیاڵ، مەراق

گ

گرامەر(گریكی): ڕێزمان، دەستووری زمان

گڕان: پێبوون، داگیرسان، شەوقدانەوەی چرا و مۆم و شتیوا/

دەگڕێ: پێدەبێ، دادەگیرسێ شەوقدەداتەوە

گرفە: كلپە، نێڵە، لرفە، دەنگی بڵێسەی ئاگر

گڕكان: بوركان، ئاگرڕێژێن، ئاگری

گڵكۆ: قەبر، گۆڕ

گۆشكردن: فرچك دان، بەخێوكردن

گۆڤەند: دیلان، بەزم و هەڵپەركێ، داوەت

گولی: خۆرە، دووزامی، گەڕی، پیسكی، گوپییەتی

گەرداو: فەرتەنە، باهۆزی دەریا

گەمار: پیس، چەپەڵ

گەو: ئەڵقە، بازنە

ل

لمۆز: لمبۆز لمووز، پۆز، قەپۆز، دەمولووتی حەیوان

لەگۆچوون: سڕبوون، تەزین، ڕچان، بەستن لەسەرمان

لەنگەرگرتن: داوەستانی مەل بە هەواوە، وەستان و مەیینی باڵدار لە بەرزاییدا

لیفكە: لفكە، لووفك

لێوانلێو: لێواولێو، لێوڕێژ، پڕاوپڕ، تەواو تژی، كەیل

لێوڕێژ: لێوانلێو، لێواولێو، پڕاوپڕ، تەواو تژی، كەیل

م

ماخۆ: خاوەن، خودان، خێو، ساحێب

مز: دەستهەق، كرێ

مشوورخواردن: خەم خواردن، بەتەنگەوەبوون

ملۆمۆكردن: مرومووش كردن، ملومووش كردن، بۆن پێوەكردن

موزێ: مۆزەخانە، ئەنتیكەخانە

مۆری: مووروو

مۆزێ: مۆزەخانە(پاشگری"خانە" زێدەیە و بەكارهێنانی هەڵەیە"

مەرەكەب: حیبر، جەوهەر

مەزدە: ناوی ئاهورەمەزدایە، كە گەورەخوای ڕووناكییە لە ئاینی زەردەشتیدا

مەیتەر: سەیز، خزمەتكاری ئەسپ و ولاغان

مێردەزمە: مێردەزمووكە، دێوەزمە، موتە، مۆتەكە، كابووس

میل: مێڵ، تیرۆكە، ئەو زمانەیەی كات و شوێن نیشان دەدا.

ن

ناشنا: نابەڵەد، غەریب، كەسنەناس، ناشناس

نامۆ: نابەڵەد، غەریب

نەوا: پەنا، دالدە، نووا، ئارامگە، جێی حەوانەوە

نەوال: نەوال، نوهاڵ، دۆڵ، شیڤ، دەرەی ناو شاخوداخان

نیر: نیل، نێلە، ئەو دارەی دەخرێتە سەر ملی گاجووت

نێرگەلە: فلیان، نەرگیلە

نێسكەنێسك: لەنجەولاری ئەسپ، سەمای ئەسپ

نێڵەنێڵ: گرفەگرف، كلپەكلپ، لرفەلرف، دەنگی پێت و هاڵاوی ئاگر

و

ورشە: بریسكە، بریقە، گرشە

ه

هزر: بیر

هۆبە: ئۆبە، هۆب، کۆمار، زۆم، کۆمەڵەرەشماڵێکی پێکەوە هەڵدراو.

هوندور: ناو، نێو، دور، ژوورەوە

هەدادان: ئۆقرەگرتن، دابینبوون، ئارام گرتن، داسەکنان، تۆتکەگرتن

هەرمێن: رمێن، برەو، رەواج

هەش: خم، خوم

هەلاج: پەرەکەر

هەڵزنین: سەرکەوتن، هەڵگەران(بە بەرزاییدا)

هەنووکانە: ئێستا، هەنووکە، نهۆ، نها، ئەلعان، نووکە

هەنیە: ئەنی، هەنی، ناوچەوان، تەوێڵ

هەودا: دەزوو، داو

هەوینگ: زەل و قامیشەڵانی زۆنگاوان

هێما: ئاماژە، ئیشارە

**سەرچاوە:**

برووسکە چاندن، عەبدوڵا پەشێو

چاپی دووەم، کوردستان، هەولێر(٢٠٠١)، چاپخانەی رۆشنبیر.



# دوو ئاوا بوون.
# عەبدوڵڵا پەشێو، لەنێوان ڕەنگ و ماناکانی ڕەنگدا



*دانی ئێواران
سەرنج دەدەمە ئاوابوونی خۆر..

**سامی هادی**

**دەزانم منیش، زوو بێ یا درەنگ،**
**دەبێ ئاوا بم.**
**بەڵام، مخابن، دەمی ئاوا بوون.**
**وەکوو زەردەپەڕ سیحراوی نابم.**

٢٠٠٠/١/٧ هێلسنکی بەرەو زەردەپەڕ ل ١٦١ چاپی سوید

پەشێوی شاعیر، لەنێو ئەم هەناسە کورتانەی شیعردا، هێندە سەیری مەوداکانی زەمەن دەکات، لەنێوان کورت بوونەوەو درێژبوونەوەی کات دا، ماناکانی شیعرو خەونە ئەزەلیەکانی وشەت بیر دەچێتەوە، جارێکی تر ڕوبەڕووی بەرەنگ بوونی ماناو، بەرەنگ بوونی وشەکان دەبینەوە. "دانی ئێواران" ئەو ڕەنگە خۆڵەمێشیەیە، لەنێو تەنیاییەکانی خودەوە، ماڵێك لەتێڕامانی قاوەیی بەدی دەکەیت، بەڵام ئەو ماڵە، تەنیا شیعر و وێنە چڕەکانی شیعر، دەتوانێ، خەونی خەواڵووبوونی پەنجەرەکانی بدوێنێ. ئێواران، کردنەوەی پەنجەرەیەکە.

لەڕووی هەموو ئەو نیگەرانیانەی، نە زمانی شەقام تێدەگات و، نە ئەو گفتوگۆ خوو بەخووەش، سەرنجەکانی دەدۆزێتەوە. لێرە، تەنیا بەرجەستەبوونێکی ڕۆحی دەبێت بەو پرسیارەی، کە ئەویش، سەرنج دانە لە "ئاوابوونی خۆر" چرکە زەمەنیەکانی ئەم سەرنج دانەیش، هەر لەتاقی ئێوارەدا، ماناکانی بەڕەنگ بوونی خۆی دەدۆزێتەوە - لێرەشەوە، شیعریەتی پەشێو، هێندە باڵا دەکات، کەتۆ ناتوانیت، تەنیا سەرنج بدەیتە، ئەم دیالۆگە نێوخۆییە کەشیعر، لەدەمی ئێوارەدا، سەرنج دەداتە ئاوابوونی خۆر، هەموو ماناکان، وێنەکان - بەسادەیی زمانیشەوە، لەخاڵێکی قاوەیی، هێندێ جاریش تێکەڵ بەزەردێکی دوا هەناسەی پایزی، تێکەڵ دەبێت. ئای لەم ڕەنگانە، چەند لەمانا خۆشەویستن، چەن لەمانای وشە، پڕ مانای سیحر ئامێزی، ڕامانکێن. تەنیا خودی شاعیرو چرکە زەمەنیەکانی شیعر، دەتوانن. واتای لەدەرەوەی لوژیك. بۆ ئەم هەڵچوونە، پڕ لەبێدەنگیە بدۆزنەوە - ئەگینا، فەرهەنگی زمان - بەهەموو فراوانیەکەی خۆی ناتوانێت - نیگەرانی ئەم ئێوارەیەت، بۆ پێناسە بکات، ئەگەر پەنا نەباتە، بەر شەپۆلەکانی خۆشەویستی بەرەنگ بووانی ماناکان. دەزانم منیش، زوو بێ یا درەنگ، دەبێ ئاوا بم.

گەڕان بەدوای قەدەری ئاوابوون، لای پەشێوی شاعیر، گەڕانێکی میتافیزیکی، یان تەنیا تەسەوفێکی مەرگ ئامێز نیە، دڵنیایە، ئاوابوونی خۆر، ئاوابوونێکی زەمەنیە، ئاوابووانی مەرگی، ڕەنگ و ، مەرگی جەستە نیە. کەوایە شیعریش لەم پێوانە ئەزەلیەوە، سەیری هەنگاوەکانی بەڕەنگ بوونی ژیان دەکات. شاعیر ئەگەر تەسلیمی، ئەو قەدەرە ئەزەلیە ببایە، بێگومان، ڕاگەیاندن مەرگی شیعرو لەسەرو هەمووشیانەوە، بەڕەش سەیرکردنی وشەکانی، پێ ڕادەگەیاندین.

داهێنان و گەورەیی ئەم دەقە، لەنێوان چرکەساتەکانی مەرگ و ماڵئاوایی و بەخاك بوونی جەستە نیە. بەڵکو، لەساتەوەختەکانی هەموو خۆرئاوابوونێکدا، زەمەنێکی تر چاوەڕوانمان دەکات، ئەمیش داگیرسانی ڕەنگی خۆرهەڵاتێکی ترە. شاعیر جەستە نابەخشێتە شیعر، شاعیر، لەنێو مەرگ و گۆڕستانەکانی تاریکی دا، بۆ مردن، ناپارێتەوە. بەڵکو لەنێو بەراوردێکی بەردەوامی دیالۆگی مانەوەدا.

**شیعر، هەمیشە مردووییەت، ڕەنگەکان زیندو دەکاتەوە. ئاخۆ ئەم چرکە شیعریانە، زادەی چ لەدایك بوونێکن، گەورەیی شیعر**

دەیخولقێنی، یان داهێنان و توانای گەورەیی شاعیر، بەبێگومان، هەردووکیان.

**بەڵام مخابن، دەمی ئاوابوون،**

**وەکو زەردەپەڕ، سیحراوی نابم.**

ئەوەی مایەی سەرنجە، لای پەشێوی شاعیر، بەهیچ شێوەیەك هێمانەکردنە، یان تەسلیم نەبوونە، بەو قەدەرە میتافیزیکیە، کە هەمووان، دواجار دەگەڕێتەوە.

بۆیە خاك بوونێکی تر، ئەو، لەڕامانە ئێوارانەکەی خۆیەوە، مەرگ و ماناکانی مەرگی بەخشیوەتە، شیعر. شیعر، بەچ ئاسۆ و ئاراستەیەکی دەبات. ئەوە شیعرە، نەك زەمەنەکانی بەئاگایی شاعیر. ئەوە ئەندێشەو شەڕە گەرمەکانی خەیاڵە. نەك پاڕانەوە لەخواوەندە بەردینەکان، ئەوەتا نیکۆس کازانتزاکیس لەڕاپۆرتی بۆگریکۆ دەڵێت.

**"خودایە، من کەوانێکم وام لەدەستا**

**رامکێشە ئەگینا دەرزێم".**

بەڵام، پەشێوی شاعیر، پەنا بۆ هیچ، لەپەنجەرەیەك لەو پەنجەرانە نابات و. "مخابنیش" لەو چوارچێوەیە، کۆدەکاتەوە: کەڕەنگی دەمی ئاوابوونی ئەو، قەت نابێت بەڕەنگی پڕ لەخۆشەویستی زەردەپەڕ چونکە زەردەپەڕ، هێندە سیحراویە. خەفەت بۆ ئەو سیحرە دەخوات. کە شاعیرە، لەیەکەم، بەڕەنگ بوونی هەموو ماناکاندا، نەیتوانیوە بکاتە. ئەو ئاستەی زیندووبونەوە. رۆمانسیە. کە ئەمەش رێك پێچەوانەی دوا وەسیەتی مارکسیزە کاتێ دەڵێت:

"ئەگەر خواوەند، جارێکی تر تەمەنم پێ ببەخشێ. جلوبەرگی سادە دەپۆشم. لەبەر هەتاودا رادەکشێم، نەك تەنیا جەستەم لەبەر خۆردا هەڵەخەم. بەڵکو رۆحیشم هەر دەخەمە بەرهەتاو".

پەشێوی شاعیر، لەچوارچێوەی ئەم وێنە شیعریە، باڵا بەرزەیەوە، لەبەردەم گفتوگۆیەکی ئەندێشە ئامێزدا - "دەمی ئاوابوون و، سیحراوی نابم"

منێك، سەرسەخترین، زیندوبوونەوەی رەنگەکانە. نیگەرانی خەفەتێکیشە. ئەگەر پێوانەیی هەبێت لەنێوان سیحراوی بوونی زەردەپەڕو + سیحراوی بوونی من - ئەوە رەنگەکانی خۆرئاوابوون، لەگەڵ ئاوابوونی خودی خۆیا، بەراورد ناکات، ئەم پێچەوانەیەش، لەڕەنگی قاوەیی دا، خۆی بەدیدەکات، قاوەیی خۆرئاوابوون، قاوەییەکی زەرد ئامێزە، بەڵام قاوەیی. ئاوابوونی رۆح و جەستە، قاوەیی خاك و خەواڵوبوونی گۆڕستانە - کەواتە ماناکان، لەڕووی بەرجەستەبوونی زەمەنیەوە، یەکیان گەڕانەوەی بەردەوام بوونی هەیە. بەڵام قاوەیی بوونی دووەم. یاخود بەڕەنگ بوونی قاوەیی دووەم، گەڕانەوەیەکە، لەنێوان ماناکانی میتافیزیکداو، ماناکانی تواندەوە لەنێو هەناسەکانی شیعرو شیعریەت بوون دا. خودی پەشێوی لەم هەناسە باڵداریە پڕاوپڕ لەشیعردا، هیچ لەو مانایانە ناگرێتە خۆی، چونکە هێندە لەگەورەیی شیعر رادەمێنێ. یان شیعریەت هێندە باڵانمایە لای ئەو - مەرگ بێجگە لەخۆرئاوابوونێ هیچ مانایەکی تری نیە، جەستە، نازانێت گۆڕستان، لەکوێیە. ئەوەی هەمیشە، بەزێندوویی، بەپەنجەی پیانۆیەکی ئێستاتیکایی خۆیی هەڵدەواسێت - ئەو هەناسە، ئێجگار کورتەی کە لەبۆتەی ئەم وێنە شیعریە، رەنگاورەنگەی پەشێوی شاعیردا، کەهەر جارەی بەشێوازێك لەشێوازەکانی "رەنگ بووندا" پێناسەکانی بەشیعریەت بوونی خۆمان پێ دەڵێت و هیچی ترن.

# چەمکی خۆشەویستی لە شیعرەکانی عەبدوڵڵا پەشێودا

ئوسامە حوسێن ڕەسووڵ

## پێشەکی

شیکردنەوە و باس لێوەکردنی لایەنی خۆشەویستی و چەمك و تێگەیشتنی لای(عەبدوڵڵا پەشێو)، ئەوەندە کارێکی ساکار نییە کە بۆ یەکێکی وەکو ئێمەمانان بتوانین بەو مەبەستە بچینە ناو ناخی شاعیرو هەوڵ بدەین سەرەتایەك بۆ دروستبوونی دەلالەتی خۆشەویستی و عیشق لەلای دەستنیشان بکەین و لەسەری بدوێین، چونکە ئەگەر بتوانین هەندێ لە واقیعی شیعرەکانی نزیك ببینەوە، ئەوا لە زۆر واقیعی تر دەستەوەستان دەوەستین و لەمەملەکەتی عیشقی ئەودا پێویستیمان بە هەمان هەستکردن بە موعانات و ئەندێشەکانی هەیە وەنەبێ هەر کەسێکیش کە بیەوێ باسی عیشق و سووتان بکا لای هەر شاعیرێ دیاردەی سەرکەوتوویی پێوە دیارنەبێ و نەتوانێ نموونە شیعرییەکانی ئەو شاعیرە شیبکاتەوەو مانا و چەمکی عیشق لای شاعیرەکە تێنەگا وەك تەلیسم لەناو مێشکی بمێنێتەوە.

### چەمکی خۆشەویستی لە شیعری نوێی کوردیدا

بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر چەمك و تێگەیشتنی خۆشەویستی و تێڕوانینی شاعیر، ڕوو لە شیعرەکانی دەکەین و نموونەکانی لێوەردەگرین، تا پێناسەی خۆشەویستی لای شاعیر دەستنیشان بکەین و پێش چاوی بخەین.

لە شیعری(تابلۆی ژیانم)دا دەیەوێ کەڤاڵێکی ژیانی خۆی بکێشێ و گوزارشت لەخۆی بکا، لە پاڵ ئەمەشدا دەیەوێ باسی کاریگەری خۆشەویستی بکا لە ژیانی خۆیدا، کەلەم چوارینەدا دەردەکەوێ:

منم گەردانەی گەردەنی خەیاڵ
ساتێ فریشتەی جوانیم دێتە پاڵ
تابلۆی هونەرم بۆ ساز دەکاتن
بۆی دێمە بزە خرپە گروگاڵ

ئەو کاتە باس دەکاو وەسفی ئەوە دەکا کە فریشتەی جوانی دێتەپاڵ، بێگومان ئەو فریشتەیەش چەند سیفاتی تێدایەو شاعیر دەیەوێ ئەوەش ڕوون بکاتەوە کە ئەم سیفەتانەی فریشتە جوانەکە واله شاعیر دەکا کە بێتەبزە، خرپە، گڕوگاڵ. ئەو هەستەی وا دەکا کە ئەو هەموو کاردانەوەی هەبێ بەهۆی ئەوەیەوە کە تابلۆی هونەری بۆی ساز و ئامادە دەکا. لەسەرتاپای ئەم وێنەجوانەی کە شاعیر ئەخشاندوویەتی، دەتوانین بڵێین پێشوازیکردنی لە خۆشەویستی پێشوازیکردنێکی سەرەتاییە، لە شیعرەکانی دواییدا وێنە شیعرییەکانی بەرەو بەهێزبوون دەڕوا. هەروەها ئەگەر باس لە زمانی شیعرەکەش بکرێ، ئەوە دەتوانین بڵێین کە زمانێکی سادە و ساکارە و لە ئاستی شیعرەکەدایە، ئەگەر بزانین گوتاری شیعری ئەو سەردەمە بەو شێوەیەبووە، وەك سەردەمی هاوچەرخایەتی ئێستا نییە، کە زمانێکی قووڵ و گرانبێ و پێویستی بە وردبوونەوە هەبێ لە پاڵ ڕۆشنبیرییەکی هەمەلایەنە.

ئەوەی جێگای سەرنجە کە شیعرەکانی دیوانی(فرمێسك و زام) جیاوازییان لەگەڵ شیعرەکانی تری کە لە دیوانەکانی دیکە بڵاویکردۆتەوە گەلێ زۆرە، چ لە بارەی بەکارهێنانی زیاتری کەرەستەی هونەری و شێوازو فەلسەفەدا، چ لە بارەی لێکگرێدانی مەسەلە خۆشەویستییەکان و کوردایەتییەوە، بۆیە دەبینین ئافرەت و کوردایەتی و جیاوازی چینایەتی، هەموو کەرەستەی نووسینی بوونە، هەروەك خۆی بە ئاماژەیەکی کورت لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی هاوکاری دەڵێ:"جاران بێدەنگ دەگریام، ئێستا دەنگم دەردەچی"[٧]. ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردنیشە ئەوەیە کە شاعیر زۆر بە سانایی و لەبەرائەتی یەکەم جاری ڕۆچوونە ناو دنیای عیشقەوە دەستی پێکردووە، کە بەرائەتی عاشقێکی پاك و دڵ سافی لێ دەڕژێ، ئەو بەرائەت ڕژانەش زۆر توندتر و خێراتردەبێ، هەروەك لە شیعری(خۆفرۆشتن)دا ڕەنگدەداتەوە، کە ڕوودەکاتە ئەو کچەی خۆشیدەویست، ئەویش هەموو سامانی خۆشەویستی خۆی لەخۆ فرۆشتن بەبڕێ پارە دەبینێتەوە، ئەوەتا شاعیر لەفەزایەکی پڕ دەنگ بەرزکردنەوەیەکی شاعیرانە کە هەموو مانایەکی ئەدەب و شکۆدارانەی شاعیرانەی تێیا ڕەنگ دەداتەوە:

کیژۆڵەی دڵگیر ئەی لەخۆبایی
بۆچی دەمکوژیت، بەناڕەوایی
بۆچی دڵ ڕەقی بەرامبەر بەمن
کەبت پەرستم، هەتاکو مردن

عاشقی دڵ سووتاوی پڕسۆ بەکۆمەڵە پرسیارێکی عاشقانە هێرش دەکاتە سەر کچە خۆشەویستە بێوەفاییەکەی کە لەخۆبایی بووە پاش خۆفرۆشتن بە بڕێ پارە و هەموو مانایەکی خۆشەویستی و وەفاداری خستۆتە ژێرپێی و بە دیواری زەمەنێکی دڵڕەقی داداوە. ئەو پرسیارانەش بۆنی سووتان و دڵکڕووزانی لێ دێ لەکاتێکدا شاعیر زۆر بوێرو ئازایانە پرسیارەکان دەکات و چاوەڕوانی وەڵامدانەوەش ناکا، چونکە لە هۆیەکەی گەیشتووە:

دەزانم بۆچی دڵ پڕ لە قینی
لە چەقی ڕێگا چاوت نامینی

**چونکه لاوێکم دڵپاك و وەفادارم بۆت**

**شەوانی تاریك لە ئازارم بۆت**

**چونکه لاوێکم ڕاستم فێڵبازنیم**

**چونکه چاوبازنیم بە فیز و نازنیم**

**چونکه جل ڕەنگاو ڕەنگی جادەنیم**

**چونکه قومارچی و فێرە بادە نیم**

**چونکه نازانم نەکەم و نەزۆر**

**ڕووی ماکیاج بکەم هەر ڕۆژ بە سەد جۆر**

هەموو ئەو سیفەتانە دەژمێرێ کە کچێکی هەڵخەڵەتاو بە سامان و جوانی دنیا پێی هەڵدەخەڵەتێ و خۆشیو شادی پێوەندی نێوان کچ و کوڕی تێدا دەبینێتەوە. لە سەرەتاشدا کچەکە ئەو ڕێسایەش نازانێ و لێی غافڵە کە هەموو سامان و سەروەتی جیهان ناتوانن بزەیەك، شادییەك، خورپە و خۆشییەك، بۆ دڵە مردووەکان و چاو بەفرمێسك و دڵشکاوەکان بکڕێ، یان هیچ نەبێ بتوانن جاربەجاریش بێ، بەشدارییان پێبکەن لەگەڵ ئاهەنگێڕە درۆزنەکانی عیشق. جا لەبەرئەوەی شاعیر ناتوانێ وەك ئەو درۆزن و هەڵخەڵەتێنەرو فێڵبازانەبێ و هەرساتێکی بە جۆرە جلێکی ڕەنگاو ڕەنگ لەسەرجادەکان چاوەڕوانی بکاو ڕاوی دڵەتێنووەکان بکات و کاروپیشەی قومارچی بێ بەهەمووشتێ لە دڵپاکی و وەفاداری هی ئەو کەسەی خۆشی دەوێ و لە پێناویدا لە شەوانی تاریك لە ئازاردەبێ بۆی. شاعیر لەبەرئەوەی ناتوانێ هەموو ڕۆژێ ڕوو و دەم و چاوی بە سەدجۆرە ماکیاج و دەمامك داپپۆشێ و هەر ڕۆژ بەچەندەها جۆرێ، بۆیە ئەو کچە شاعیری ناوێ، بەڵکو(دون جوان)ێکی دەوێ کە ئەم سیفەتانەی تێدابێ:

**دون جوانێك نیم سینگ دەربەڕێنم**

**لە سینەماکان تێر بتکەڕێنم**

ئاشکرایە کە یەکێ لەو دەردەکوشندانەی کە تووشی کۆمەڵگای ئێمە بۆتەوە و لەسەر هەموو ژیانی ڕۆژانەماندا ڕەنگی داوەتەوە ئەوەیە، کاتێ کوڕێکی هەژار دەیەوێ کچێك بکا بە هاوسەری ژیانی دوا ڕۆژی، دەبینین، چونکە هەژارەو خاوەن تەلار و کۆشك نییە و بەندەی سەربەرزییە و بەندەی دۆلارو دینار نییە و لەجیاتی سامان و پارە دڵێکی تانەمانی پێشکێش کردووە کە پڕیەتی لە وەفاداری و خۆشەویستی، ئەمەش لەلای شاعیر لە هەموو سامانی جیهان بەنرخترە، چونکە نافەوتێ و کۆتایی نایێ و هەردەم گەنجینەیەکی نەمر و لەبەرچاوە. مرۆڤ چی لە پارە و سامان بکا لەکاتێکدا دڵو دەروونی ئاسوودەو گوشاد نەبێ. مرۆڤ چی لە پارە و سامان بکا کە خۆی دۆڕاند. بۆیە کچە لەخۆباییە کە شوو بە کوڕە کە ناکاو دڵەی پڕ زامداری پڕسوێتر دەکات. ئەوەتە شاعیرئەو هۆیەی بە شیعر ڕوون کردۆتەوە:

**چونکە هەژارم خاوەن تەلارنیم**

**بەندەی سەربەرزیم بەندەی دینارنیم**

**چونکە لە جیاتی دیاری یاسامان**

**پێشەکەشم کردی دڵێك تا نەمان**

لە کۆتایی شیعرەکەی هەمان مەبەستی پێشوو دووبارە دەکاتەوە کە پوختەی مەبەستی شیعرەکە دەستنیشان دەکا:

**"بەڵێ بۆیە تۆدڵ پڕ لە قینی**

**لە چەقی ڕێگا چاوت نابینی"**

وەنەبێ ئەو دەردە کوشندەیە هەر لە سەردەمی شاعیردا هەبووبێ، بەڵکو لە سەردەمی ئێستاشدا هەیەو بەردەوامەو سەردەم بەسەردەم ڕۆیشتووە، چونکە ئەوەی تێبینی کراوە لەم کۆمەڵگایەدا تەپیوو دواکەوتووەی ئێمەدا ئەوەیە، کەشتە سلبییەکان ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادبوون و تەشەنەکردنن و برەو و بازاڕی هەردەم گەرمە و لایەنە ئیجابییەکانیشی وەك وەفاداری بۆ نموونە هەموو کات دەرگاکانی ژیانی بەسەرداخراوە، بۆیە پاشکەوتن و پێشکەوتنی میللەت بەو پرانسیپانە بەستراوەتەوە، جا ئەو لایەنە ئیجابیانەی کە لە کۆمەڵدا هەنە لەکاتێکدا برەویان نەما کۆمەڵگا بەرەو نەمان و فەوتان و شڵەژان دەبەن و ئافرەت واڵێ دەکەن چاوی لەبەرامبەر هەموو داخوازییەکانی دڵ بنووقێنێ و ڕووبکاتە پارە و سامان و ماناکانی خۆشەویستی بشێوێنێ. لێرەدا پرسیارێکی گرنگ سەری خۆی هەڵدەدا.

ئایا شاعیر هەر بەم شێوەیە ڕەشبین بووە بەرامبەر بە مەسەلەی خۆشەویستی، دەتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە بەوەی بڵێین: ڕەشبینی شاعیر بەرامبەر خۆشەویستی وەك لە شیعری(خۆفرۆش) دیارە، مانای ئەوە ناگەیەنێ کە شاعیر لە سەرجەم شیعرەکانی ڕەشبین بووە، بەڵکو زۆر شیعری هەیە کەدەربڕین لەخۆشویستنی ژیانی خۆشەویستی دەکاو دەیەوێ بیسەلمێنێ کە دەتوانێ بەهۆی خۆشەویستی ڕاستەقینەوە جیهان و ژینگەیەکی خۆش دابمەزرێنێ کە هەموو دڵەکان تێیدا ئاسوودەبن و خەون و ئاواتەکانیان بهێننە دی:

**توخوا گیانەکەم لەگەڵ بەیان زوو**

**بمگەینە کۆشکی بەرزی ئارەزوو**

**وەك پەیکەرێکی دەسکردی خوایی**

**بمخەرە ژینی پڕ دڵنیایی**

لێرەدا بانگەوازی یارەکەی دەکا کە بەیانی زوو بێتە لای و بیگەیەنێتە کۆشکی بەرزی ئارەزووەکان، ئەو ئارەزووانەی کە بەبێ بوونی ئەو ناتوانێ بیگاتێ و بەدەستی بهێنێ، بۆ داهاتووی گەش، کەواتە کاتێ ژیانێکی پڕخۆشی و گوشاد بۆ شاعیر دروست دەبێ کە خۆشەویستەکەی لەگەڵ بولێڵی بەیانی بێو دەستی بگرێ و بیباتە کۆشکی بەرزی ئارەزوو، ئەگەر ئەمە شتێ بگەیێنێ، ئەوە دەگەیەنێ کە هەر بەدیتنی دڵخواز شاعیر هەموو ئارەزووەکانی دێتە دی و دەکەوێتە ناو ژیانێکی پڕ ئاسوودەیی، کەواتە مرۆڤ لەژێر سێبەری خۆشەویستی ڕاستەقینە دەحەسێتەوە و تێرایی دێتەوەو

ئارەزووەکانی تێر دەبێ.

شاعیر هەر بەوەندەش ناوەستێ بەڵکو داوا لە خۆشەویستەکەی دەکا هەر بە چاوی پڕ خەو و بەپۆشاکی فریشتەی خەو، هەناسەیەکی تر ببەخشێتەسەر پەڕەی گوڵی ژیان، کە دیارە هەناسە بەخشینەوەش بە هێمای دووبارە ژیانەوە دێتەوە.

ئەو ژیانەوەش لەگەڵ خەندەیەکی پاکی بێگرێ، موچڕکێك دەخاتە سەر دڵی شاعیر و دیل ئاسا دەیگرێ، لەپاڵ ئەمانەشدا داخی شەوی درێژ کپدەکاو، خرپەی دڵی خۆی بۆ هەڵدەڕێژێ:

وەرە بەردەرگا بەچاوی پڕ خەو

هەر بە پۆشاکی، فریشتەی شەو

هەناسەیەکی بۆن خۆشی لێوان

بخشێنە بەسەر پەڕەی گوڵی ژیان

بەخەندەیەکی پاکی بێگرێ

موچڕك دڵم وەك دیل بگرێ

تا کپ کا داخی شەوی درێژم

کە خرپەی دڵم بۆت هەڵدەڕێژم

ئەگەر تەماشای شیعرەکە بکەینەوە، دەبینین ئەو حاڵەتە دەروونییەی کە شاعیر تێیدا داوای لە خۆشەویستەکەی دەکا کە تۆزێ ببێتە هاوڕێی شەوانی ناخۆشی و ناڕەحەتی ژیانی لەبیربباتەوە و هەوڵبدا گوێی لێبگرێ تا چی لەناو دڵی دایە بە پەنهانی و کپی کردووەو دەیەوێ هەڵیبڕێژێ، بەهەمان مەبەست لە شیعری(لەبەردەرگە) ڕەنگیداوەتەوە کە شاعیر لە شەوێکی ڕاشکاودا دەچێتە پێش دەرگەی دڵی خۆشەویستەکەی تا بۆ تاقە شەوێکیش بێ ببێ بە هاوڕێی:

شەو ڕاشکا

ئەژنۆم شل بوو

مانگ بەتاقی ئاسمانەوە هەڵپڕووکا

دەرگەکەتم لێ بکەوە

بۆ چنینی چەپکە نێرگزێکی چاوت

بۆ نووچ دانێ

بۆ خەونێ تۆزێ گریانێ

لەسەر هەوری قژی خاوت

لە هێمنی شەو کە ڕادەکشێو و مانگ هەڵدەپڕووکێ، شاعیر دەبینین لە پێش دەرگای خۆشەویستەکەی ڕاوەستاوە و ئەژنۆی شلبووە، کەچی ئەو دەرگاکەی لێ ناکاتەوە، وەك ئەوەی گوێی لێ نەبووە و بە خەیاڵی دانایێ و دڵە ڕەقەکەی تۆزێ نەرم بکاو سۆزی لێ بڕژێ و دەرگای دڵی بۆبکاتەوە، لە کاتێکدا باش دەزانێ مرۆڤ لەکاتی تەنگانەدا پەنا بۆ خۆشەویسترین کەس دەبا کە تێیدەگاو ئەمیش لەو دەگا و زەمینەی تێگەیشتن و ئاوێزانبوونی دڵەکانیش لەبارەو دەتوانن شفرەی گفتوگۆی یەکتر بخوێننەوە. ئەوەتا شاعیری عاشق بۆ چنینی چەپکە نێرگزێکی چاوی یارەکەی هاتووە، لەگەڵ نووچدانێ، خەونێ، تۆزێ گریانێ لەسەر هەوری قژی خاوی یارەکەی کە بۆ ئەوەی دڵی پڕێشو زامداری ئۆقرەبگرێ و دابمرکێ و ئەندێشەی چەند ساڵانی دابمرکێ و برینەکانی ساڕێژببێ، لەپاشان بە دەنگێکی بەسۆزەوە هۆی هاتنەکەی لەم شەوە تاریکەدا ڕوون دەکاتەوە:

لەگەڵ سیمای منالّیما

لەگەڵ خەمی شۆڕەبیما

هاتووم و ناگەڕێمەوە

یا پێت دەگەم

یا وەك مۆمێك دەسووتێم و دەتوێمەوە

ترووسکەی شاری یادگارییەکانی ڕابردووی خۆشەویستی بانگی کردووە لەگەڵ سیمای منداڵی و خەمە شۆڕەبییەکان کە دارێکەو لکەکانی شۆڕدەبێتەوە، کە دەیەوێ غەمی خۆی وەك شۆڕەبی لێبکا لە درێژبوونەوەو شۆڕبوونەوە بەناو ئازار و ناخۆشییەکانی لێکدابڕانی لە یارەکەی، ئەمانە تێکڕا وای لێکردووە بڕیارێکبدا کە یا بەدیداری دڵی شاددەبێ و چەپکەنێرگزی چاوەکان و نووچدان و خەون و تۆزێ گریانێ بەدەست دەهێنێ، یان وەك مۆمێك دەسووتێ و دەتوێتەوە.

**گەیشتن بەیار- چەپکە نێرگزی چاو+ نووچدان+ خەون+ تۆزێ گریان**

**نەگەیشتن- توانەوە ئاسا تا نەمان و مردنی**

کە لەم دێڕەی دواییدا شاعیریەتی بەرجەستە دەبێ کە خۆی دەکاتە مۆم و ئەو شەوە تاریکە ڕووناك دەکاتەوە تا دادەمرکێتەوە لەپێناوی گەیشتن بە دیدار، هەر بەمەندەش ڕاناوەستێ، بەڵکو دوپاتی دەکاتەوە:

دەرگەکەتم لێ بکەوە

هەر دڵدارەکەی جارانم

هەر کێڵگەکەی بەر دەرگەکەتم

هەر تینووەکەی کرێوەو لێزمەی بارنم

ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە شاعیر نەگۆڕاوە و ئەم خۆشەویستی ناکا لەپێناوی چەند ساتێکی کورت بۆ گەیشتن بە مەرامێکی تایبەتی خۆی، کە مەرام و نیازەکەی بۆ جێبەجێ بوو لە ناوەڕاستی ڕێگای ژیان دڵدارەکەی بەجێ بهێڵێ و ژیانی بکاتە دۆزەخ و ژیان و ژینگەی لێ تارو بێزاربکا تا لە خۆشی بێزاربێ، بەڵکو هەر دڵدارەکە و کێڵگەکەو تینووەکەی کرێوەو لێزمەی بارانەکەی جارانەو نەگۆڕاوە لەمەشدا چەقی جەمسەری وەفاداری پیشان دەدات کە لەناو لاوەکانی ئەو سەردەمەی ئێمەدا دەگمەنەو خۆشەویستی زۆربەیان تەنیا بۆ گەیشتن بە مەرام و مەبەستی دیاریکراوو ئارەزووی منداڵانە و هەرزەکارانە دەڕواننە ئەو مەسەلە گرنگەو چارەنووسییە لێکدانەوەکانیان وەکو هەتاوی زستان زوو دەڕەوێتەوە، بۆیە لەلای شاعیردا باشترە کچێك بکوژی لەوەی گاڵتە

به هەست و سۆزی بکەی، چونکه بەو مانایه دێ که ژیانی تێکبدەی و نەوەیەکی داهاتووش بشێوێنی و داهاتوویان ڕەش بکەی، بەڵام ئەوە ئادگاری شاعیر نەبووە و نییە، بەڵکو ئەم بۆ شتی لەمانه پیرۆزتر هاتووە:

**شەو ڕاشکا**
**ئەژنۆم شل بوو**
**مانگ بەتاقی ئاسمانەوە هەڵپرووکا**
**دەرگەکەتم لێ بکەوە**
**دار و بەردی بەر دەرگەکەتان هاتنە تکا**

دووباره باسی ئەو ڕاشکان و ئەژنۆ شل بوون و هەڵپرووکانی مانگی کردووە- که دیاره بۆ زیاتر سەرنجراکێشان و دەستەمۆکردنی سۆزی کچەکه وا دووبارەی کردۆتەوە- کەچی دڵدارەکەی دەرگای لێناکاتەوە، که له ئەنجامدا دار و بەردی پێش دەرگاکەیانی به زمان هێناوە، ئەو گوزارشت لێکردنه لەم دێڕەی کۆتایی تامێکی شاعیرانەی بەخشیوە به شیعرەکه له کاتێکدا جێگای خۆیەتی ئاماژەی بۆ بکرێ که شاعیری سەرکەوتوو ئەو شاعیرەیه که دەتوانێ مامەڵه لەگەڵ وشەکان بەشێوەیەکی ئیستێتیکی بکاو هەریەکەیان له شوێنی دیاریکراو دابنێ و گیانی ئەو سەردەمەیان بەبەردا بکا، که لەمەشدا ئەو دەستەواژانەی له ژیانیدا هەیه زۆرن و بەکارهێنانیان له شیعردا وێنەو نموونەی شیعری جوان دروست دەکەن.

له زۆر شیعری تردا ئەو جۆره مامەڵانەی کردووەو سەرکەوتووانه لەگەڵ ئەو دیاردانەی، یان دەستەواژانەی که له ژیانی خۆیدا هەبووە، له شیعرەکانیدا بەکاری بردوون:

**بتێك بووی دەسکردی خۆم کڕنۆشم بۆ دەبردی**
**لەساتی تەنیاییما سکاڵام بۆ دەکردی**
**بەڵام ئەمڕۆ له دەورت کۆمەڵێ کڕنۆش بەران**
**تفری نەخشی پیرۆزی پەنجەی منیان هەڵوەران**
**شێلایان ئەو شۆخییەی جێی سەرنج بوو بۆ هەڵبەست**
**ژنگیان خسته ئەو دڵەی پرد بوو بۆ ژێر پێی مەبەست**
**کەوابێ تۆ دارشتەی دەستم بی و بۆ من نەبیت**
**ئیتر بۆچی لەژێر پێم ئەنجن به ئەنجن نەبیت**

لەم شیعرەیدا شاعیر مامەڵەیەکی زۆر واقعبینانەی لەگەڵ مەبەست و چەمکی خۆشەویستی و دەستەواژەی خۆشەویستیدا کردووە، له کاتێکدا دەتوانین بڵێین که به بەشێك له دانپیانانی تایبەتی خۆی دەژمێردرێ بەرامبەر به یارەکەی، کەچی له ڕێگای شیعرەکەیدا جۆره مامەڵەیەکی لەگەڵ نائومێدی کردووە، له مەبەستی ئەوە دەخوێنینەوە که به فێرۆدانی ئەو هەموو ماندووبوونەی دەگەێنێ، که له پێناوی خۆشەویستەکەی کێشاویەتی که ببوه خەمرەوێنێك بۆ شاعیر و له ساتەکانی تەنیاییدا شاعیر پەنای بۆ دەبرد، که کەس نییه گوێ له سکاڵا و گلەییەکانی بگرێ له زەمەنه جەنجاڵەکەی شاعیر، ئەم سکاڵای بۆ دەبا، کەواته دڵدارەکەی لێرەدا زیاتر وەك سەرچاوەی خەمرەوێن و دڵدانەوە بەرجەسته کراوە، نەوەکو سەرچاوەیەکی حەسانەوەی سێکسی. کەچی هەر ئەو سەرچاوەیه مامەڵەیەکی تری لەگەڵ دەکرێ، لەکاتێکدا بەدەستی خۆی وەك بتێك دروستی کردبوو خۆشی کڕنۆشی بۆ دەبرد و خۆشەویستانه دەیپەرست، کەچی ئەمڕۆ کۆمەڵێ کڕنۆش بران و فێڵبازان و فرۆشیارانی عیشقی پاك، تفری نەخشی پیرۆزی پەنجەی شاعیریان لەسەر دڵخوازەکەی هەڵوەراند، که بەمەندەش ڕانەوەستان بەڵکو شۆخی ئەو خۆشەویستەی شاعیریان شێلا که بۆ مەبەستی سەرنج بوو بۆ شیعر لەلای شاعیرو ژەنگیان خسته ئەو دڵەی که پردبوو بۆ ژێر پێی مەبەستی شاعیر.

ئەوەی ناحەزانی عیشق مەبەستیان بێ بۆ لێککردنی دوو دڵدار، تەنیا به هەوڵدان بۆ گۆڕینی دڵەکان جێبەجێ دەکرێ، ناحەزان ناتوانن جوانی و شۆخ و شەنگی کچەکه لەدڵی کوڕه لاوه خۆشەویستەکەی بسڕنەوە چونکه هەموو ئاسمانی دڵی ئەو بەئەستێرەی جوانی کچەکه ڕازاوەتەوە، لەکاتێکدا ئەو کچە، یان کوڕەکه هەڵوێستی خۆی لەدەستدا و نەیتوانی بڕیاری چارەنووسی یەکلاکەرەوە بدات، ئەوا به ئاسانی دەتوانن دڵیان لەسەریەکتر بگۆڕن، ئەگەر گۆڕینەکەش لەلایەن کچەکه بوو ئەوا وەك چارەنووسی کچەکه و خۆشەویستییەکەی لای کوڕەکه بەو شێوه دەبێ که شاعیر باسی دەکا:

**کەوابێ تۆ دارشتەی دەستم بی و بۆمن نەبیت**
**ئیتر بۆچی لەژێر پێم ئەنجن به ئەنجن نەبیت**

ئەمەش ئەنجامی هەموو هەڵوێست گۆڕینێکه له هەر لایەکیان بێ، بەم شێوەیەش چیرۆکی خۆشەویستیان کۆتایی دێ و هەمووشت دەبڕێتەوە.

هەمان حاڵەت له شیعری(نیازێك هەڵوەری)دا دووباره دەبێتەوە، بەڵام به نەخشاندنی وێنەیەکی جیاواز:

**له شیعرێکی خەمرەوێنا**
**له دەفتەری بچکۆڵەی بیرەوەریما**
**له هەزاران شادەمار و مێشك و خوێنا**
**تۆمار دەکەم سەرگوزەشتەی**
**ئەو مێخەکەی**
**چەنەم شل بوو ئەوەندەی شیعری بۆ بڵێم**
**له دواییشا کەبابی بوو**
**هەڵم وەراند خستمه ژێر پێم**

لەم هەڵوێستەدا شاعیری خاوەن هەڵوێست و یەك بڕیار هەڵی بوەرێنێ و بیخاته ژێر پێی، چونکه خۆشەویستی به زۆری زۆردارەکی ناکرێ و هەموو جیهان کۆبێتەوە ناتوانن دڵێك واڵێ بکەن یەکێکی خۆشبوێ که له خۆبایی بێ و ئەو کوڕەی خۆشیویستووە

وەك هیچ نەبوویەك تەماشای بكاو هیچ ڕێزێك بۆ هەست و سۆزی دانەنێ و ڕێز لە هەست و نەستی نەگرێ و هەمووكات وا هەست بكا كە كوڕەكە سووتاوە، برژاوە، ئاگری تێبەربووە، تا بێتە لای و كڕنۆش ببا كە هێمای زەلیلبوون دەگەیەنێ. لە كاتێكدا شاعیر بە هەڵوێستی پۆڵایین بەرامبەر ئەو جەنگە دەروونییەی خۆشەویستەكەی بۆتەوە، هەر لە شیعرێكی دیكەی بەناوی (لە دەستم دێ)دا دەیتوانی هەموو ئەو نهێنییانە باس بكا كە لەگەڵ كچە بێوەفاو هەڵخەڵەتاوەكەی ئاشكراو ڕیسوای كوڕی یعاشقانی بكا تا ببێ بە پەند بۆ هەموو ئەوانەی كە گاڵتە بە سۆز و هەستی ئاشق دەكەن و بەناوی پیرۆزی عیشقەوە لەسەر مێزی قوماردا قومار بە چارەنووسیان دەكەن، كەچی ڕقی پیرۆزی شاعیر ڕێگای نەداوە ئەو شتانە بكاو هەردەم بە چاوێكی ڕێزەوە ڕوانیویەتیە ئەو ڕابردووە و خۆی بە مرۆڤێكی بێ ئەزموون و دڵڕەق و قینهەڵگر پیشان نەداوە، ئەگەر لە كاتێكدا بزاندرێ كە ڕقی شاعیر ڕقێكی پیرۆز و بەرزە و لەسەر هەموو مانایێكەو قینهەڵناگرێ و خۆشەویستی و مانا پیرۆزەكەی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی بەكارناهێنێ، دەشزانێ هەموو جیهان پڕی كچە، بەڵام ئەم لە دوای كچێكی وادەگەڕێ كە پێش ئەوەی لەگەڵ شتی تری شاعیر تێكەڵبێ لەگەڵ گیانی تێكەڵاو دەبێ:

**لە دەستم دێ**

**كاتژمێری كامەرانیت بوەستێنم**

**لە دەستم دێ**

**ئەڵقەی پەنجەت پێ فڕێ دەم**

**نامەی بەختت بسووتێنم**

تا دەگاتە ئەوەی كە بڵێ:

**بەڵگەم پێیە**

**هەزار بەڵگەی ئاشكراو ڕوون**

**بەڵگەی چوارساڵ پێكەوەبوون**

لە ئەنجامدا ڕقی پیرۆزی شاعیر وای لێ دەكا بیر لە هیچ نەكاتەوە، چونكە:

**خۆشەویستیت**

**نەهەنگێكە**

**خوێنی هەڵچووم دەخواتەوە**

ئافرەتیش دەبێ ئەو هەڵوێستەی شاعیر بنرخێنی و هەست بەوە بكا كە هەستی شاعیریش زۆر جیاوازە لەگەڵ هەستی كەسانی ئاسایی تر، شاعیر پێش ئەوەی جوانی و سامانی ئافرەتەكەی بوێ، گیانێكی پڕ هەستی ناسكی گەرەكە و دەیەوێ لە دوای ئافرەتێك بگەڕێ لەگەڵ گیانی بدوێ. كاتێ ئەو ئافرەتەی دیتەوە ئەوا دەوڵەمەندترین كەسەو ئاوڕ بۆ كچێكی تر ناداتەوە تەنیا حیساب بۆ ئەو ئافرەتە دەكا كە خۆشی دەوێ و لە پێناوی ئەودا دەژی و دەمرێ. بەمەش ئامانجەكانی خۆشەویستی دێتەدی و كوڕ و كچەكە دەگەنە نوختەی پێكگەیشتن و لێكحاڵی بوون، كە ئەو پێكگەیشتنە گیانیەش ڕوویدا، كۆتاییەكەشی بەخۆشی دەبێ. دەتوانن ژیانێكی خۆش و شاد پێكبهێنن و وەچەی نوێ بۆ ژیان بەرهەمبهێنن. وەنەبێ شاعیر هەر لەم بوارانەدا كاری كردبێت، بەڵكو زۆر شاعیرانە پەردە لەسەر ئەو ڕاستییە شاراوانە هەڵدەداتەوە كە لە چاوی كچی خۆشەویست ڕەنگدەداتەوە، هەڵسوكەوتی كچە ئاشكرا دەكا و لە كچەكە دەگەینێ كە خۆشەویستی ناتواندرێ بشاردرێتەوە، بەڵكو لێرەدا لیبراڵی و سەربەستییەك دەداتە مەسەلەی خۆشەویستی كە لە هەست و هۆشی ئەوكەسە سەرهەڵدەدا كە كەوتۆتە ناو دنیای خۆشەویستی، ئەوە بووە هۆی ئەوەی كە خۆشەویستییەك بێ لەو مەسەلانەی كە كەس ناتوانێ بیشارێتەوە:

**شەرم مەكە بەناوی ڕووت**

**ناوم بێنە پڕ بە گەرووت**

**با لە یەكتر ئاشكرابین**

**تاكەی لەناو ئاگرابین**

**نەتۆ(خوشكە)ی نە من(كاك)م**

**خۆشەویستی دەروون پاكم**

لێرەدا مەسەلەیەك دێتە گۆڕێ جێگای خۆیەتی ئاماژەی بۆ بكرێ، كە پێوەندی بە دەروونناسی جووڵانەوەی مرۆڤ هەیە، ئەویش كە پیاو ناتوانێ خۆشەویستی خۆی بۆ یەك دەقیقەش بشارێتەوە، بەڵام ڕقی خۆی چەند ساڵ دەتوانێ بشارێتەوە، كەچی ئافرەت بە پێچەوانەوە خۆشەویستی خۆی پێ دەشاردرێتەوەو ڕقی خۆی پێ ناشاردرێتەوە. ئەم تێگەیشتنە دەتواندرێ لە شیعری(كاك) وەربگیرێ، كە هەرچەندە كچەكە هەر بەكاك ناوی شاعیری دەهێنا، بەڵام شاعیر گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی كە ئەو خۆشی دەوێ، بەڵام شەرمی كچانە و ترسی لە كۆمەڵ و نەوەك ئەگەر بە شاعیری وت و بەناوی ڕووت ناوی هێنا وئەوا شاعیر بە چاوێكی سووك تەماشای بكات، چونكە لە كۆمەڵگای ئێمەدا شتێكی ئاشكرایە كە زەمینە بۆ خۆشەویستی تەسكەو لە بارنیە و كەسایەتی كچەكە لەسەر ئەوە ڕادەوەستێ كە هەتا مێرد دەكات خۆی لە هەموو شت بپارێزێ، بە تایبەتی لە مەسەلەی خۆشەویستی، كە زۆر تێڕوانینی تەسك و نائاشكرای تێ ئاخاندراوە. ئەگەر بیەوێ- واتە ئافرەتەكە- بشیكات دەبێ بە نهێنی بێ، ئەگەر نا ئەوا كچەكە بە چاوێكی سووك تەماشا دەكرێ و زۆرجار دەگاتە ئەو قۆناغەی كچەكە دەمێنێتەوە، كە بەم شێوەیەش كۆمەڵ تاكێك لە دەست دەدا، ئەمەش چارەنووسی هەموو جیهانە و ناتوانین لێی دەربازبین ئەگەر بمانەوێ هاوسەری ڕاستەقینەی خۆمان هەڵبژێرین كە پێش ئەوەی لەگەڵ پارە و سامانمان بدوێ لەگەڵ گیانمان تێكەڵاو ببێ هەر چۆنێ بێ، دەتوانین هیچ نەبێ بەشداری هیوا و خۆزگەی شاعیر بكەین لەكەم كردنەوەی موعانات و ناخۆشییەكانی لەوەی هەركەس لەلای

خۆیەوە ڕاستگۆیانە و بێ پەردە پێوەندی لەگەڵ یەك ساز بدەین.

شاعیر لە زۆر ڕەفتاریدا دەیەوێ مامەڵەیەکی ساکار و بێ زۆر لەخۆکردن لەگەڵ ئەڤیندارەکەی بکا و پێناسەی خۆی بۆ بکا و خۆی بناسێنێ، بە سادەیی وەك سادەیی ناوی نیشتمانەکەی کە کوردستانە. لێرەدا ئەو پێکەوەگرێدانەی شاعیر پیشان دەدا، کە دەشیەوێ بڵێ(من+ کوردستان) ئاشکرا و ڕوونین و شتی زیادمان نییە و لە مەسەلەکانی ڕیاکاری و خۆبەزلزانی و خۆشاردنەوە لە ژێر پەردە و دەمامك نازانین:

**بەڵێ سادەم**

**سادەم و هەرسادەش دەبم**

**وەکو ناوی نیشتمانم**

شاعیر زۆر ڕاستگۆیانە مامەڵەی لەگەڵ خۆشەویستەکەی کردووە، بۆ شاعیرانی ڕوون کردۆتەوە کە ئەم-واتە شاعیر- هەردەم سادە و ساکارانە دەمێنێتەوە.شیعری سەرکەوتوو ئەوە دەسەلمێنێ کە ڕاستگۆیانە شتەکان دەربڕین، کە بەڕاستی شاعیر توانیویەتی ئەو خاڵە بپێکێ و شیعرێکی سەرکەوتوو بەرهەمبهێنێ، ئەوەتا شاعیر چۆن خۆشەویستەکەی ئاگادار دەکاتەوە کە لێی نەگۆڕێ و بێتە لای و خۆشی بوێ، چونکە نایەوێ درۆزن و فێڵبازێ و سادەییەکەی خۆی بدۆڕێنێ و هەستی ئەو بشێوێنێ و قومار بە گەورەترین و پیرۆزترین شت بکا کە هەستی خۆشەویستییە:

**هەموو ڕۆژێ**

**خونێی(زین)ێك لە خەنجەرمدا دەچۆڕێ**

**گەر بێتە لام وریای خۆت بە**

**خۆشت ئەوێم لێت نەگۆڕێ**

زۆرکەس زۆر ناڕاستگۆیانە و بە دڵێکی ناپاك دەیانەوێ خۆشەویستی بکەن و هەر بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان پێوەندی لەگەڵ ئافرەتەکە دەبەستن و تەنیا تەماشای ئافرەتەکە دەکەن وەك ئامرازێکی پڕکردنی شەهوەت و سێکسبازی، بەڵام شاعیر ئەو شتانە قبووڵ ناکاو زۆر ڕاستگۆیانە مامەڵە لەگەڵ ئەو کچە دەکا کە خۆشی دەوێ و دەیەوێ پێی بڵێ کە ئەو خۆشی ویستووی وەك ئاسمان کە چەند دوورە ئەوی بە ئەندازەی ئەو دوورییەی نێوان ئاسمان و زەوی خۆشدەوێ و بە قووڵایی دەریا و بە قەد قووڵی گشت دەریاکان هەروەها دەیەوێ خۆشەویستەکەی بە نووسراوێك بچووێنێ کە دێڕێکی بە قەد تاڵی پەرچەم بۆ ماوەی پێکەوەبوونیان دەیخوێننەوە، ئەوەتا شاعیر چەند باڵی بیری لێکدەدا کەچی نەتێردەبێ و نە دەشتوانێ بیخوێنێتەوە، خۆشەویستی ڕاستەقینەش ئەوەیە هەموو ماناکانی لەخۆگرتبێ و خۆشەویستەکانی هەموو کات و ساتێ نە لە دیتن و قسەی یەکتر تێر نەبن و نەبە تەواویش لە یەکتر بگەن. بەم شێوەیەش خۆشەویستی بەردەوام دەبێ و هەموو ڕۆژێ زیاتر نوێ دەبێتەوە و شتی نوێی لێ دێتە بەرهەم.

خۆشەویستی واش هەیە کچەکە بە ئەندازەی ساڵێك دوازدە وشە ناچرپێنێتە گوێی کوڕەکە، زۆر قسەکردنیش مانای زۆر وخۆشەویستی نییە، بێدەنگی جۆرێکە لە خۆشەویستی. شاعیریش ئەو بیروباوەڕانەی سەرەوەی لە شیعری(خۆشم ئەوێی) چڕکردۆتەوە، کە ئیلهامی کۆپلەی یەکەمی لە گۆرانییەکی گۆرانیبێژی عەرەبی فەیرووز وەرگرتووە:

**خانووەکەم**

**بیستووتە ئاسمان چەند دوورە**

**من بارتەقای دووری ئاسمان**

**خۆشم ئەوێی**

**گیانەکەم تۆ نووسراوێکی**

**دێڕت بە قەد تاڵی پەرچەم**

**من چوار ساڵە ئەتخوێنمەوە**

**چەند باڵی بیرم لێك ئەدەم**

**نەتێر ئەبم نە تێت ئەگەم**

زۆرجار ڕقی پیرۆزی شاعیرانە تەنیا ڕەخنەی لە کۆمەڵ پێدەگرێ، بەڵام ئەو شیعرانەی کە لەسەری دواین لای ئێمە بەشێکە لە شیعری عاشقانەی ئەمڕۆمان کە ڕێگا بۆ لاوان ڕوون دەکاتەوە و پیشانیان دەدات چۆن خۆشەویستی بکەن. بە کورتی هونەری خۆشەویستییان فێردەکات.

لە پاڵ ئەمانەشدا خۆشەویستی لای شاعیر نەمرە و بەردەوامە. لەگەڵ ئەو بۆچوونانەی دەرمانبڕی(زمان و شێواز) لای شاعیری ئەم لێکۆڵینەوەیەمان سادەیە و لە ئاستی هونەرێکی قووڵدانییە. ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ(زمان و شێواز) لای شاعیرانی وەك(جەلال بەرزنجی، دڵشاد عەبدوڵڵا، هاشم سەراج، سەباح ڕەنجدەر، ئەحمەدی مەلا، ئازاد سوبحی) هەست بە ئاستی جیاوازی هونەری دەکرێت. ئەمەش بەڵگەی ئەمەیە کە شاعیر لە قاوغێکی سەرەتایی ماوەتەوە و پێشکەوتنی زۆر سنووردارە.

## ئەنجام

لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەماندا لەسەر چەمکی خۆشەویستی لە شیعرەکانی(عەبدوڵڵا پەشێو) دەتوانین بڵێین گەیشتووینەتە ئەو ئەنجامانە.

١. زمانی شیعری خۆشەویستی زۆر سادە و ئاسانە و دوورە لە زۆر لەخۆکردن و خۆخستنە ژێر دەمامك و لەژێر پەردەیی و دووڕوویی.

٢. هەڵوێستی شاعیر زۆر پۆڵایینە و خۆلەدەستدان و خۆدۆڕاندنی تێدا نییە.

٣. مەسەلەی خۆشەویستی لای شاعیر پیرۆزە و بۆ مەبەستی تایبەتی بەکارنەهاتووە.

٤. عیشق لای شاعیر بەردەوام و نەمرە.

٥. زمان و شێواز لای شاعیر لە ئاستی هونەرێکی قووڵدا نییە.

**تێبینی:**

ئەم بابەتە وەك لێكۆڵینەوەیەك بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی بەكالۆریۆس پێشكەش بە سەرۆكایەتی بەشی زمانی كوردی كۆلێژی پەروەردەی زانكۆی سەلاحەدین كرا، بەپلەی(ئیمتیاز) وەرگیراوە و نمرەكەی(٩٨٪) بووە كە بۆ ساڵی خوێندنی(١٩٩٦-١٩٩٧) بە یەكەم دەرچوو لەسەر ئاستی بەشی زمانی كوردی. لێرەدا بەبێ هیچ زیاد و كەمكردنێك بڵاوی دەكەمەوە.

ئ. ح. ڕ

**سەرچاوەكان:**


١. عەبدوڵلا پەشێو: فرمێسك و زام، چاپی(١)، چاپخانەی شیمال، كەركوك(١٩٦٨).

٢. عەبدوڵلا پەشێو: بتی شكاو، چاپی(١)، چاپخانەی شیمال، كەركووك(١٩٦٨).

٣. عەبدوڵلا پەشێو: شەونامەی شاعیرێكی تینوو، چاپی(١)، چاپخانەی الجاحظ، بەغدا(١٩٧٢).

٤. عەبدوڵلا پەشێو: شەو نییە خەونتان پێوە نەبینم، چاپی(١) چاپخانەی الحوادث، بغداد(١٩٨٠).

٥. سمیر الشیخانی: حصاد الفكر العالمی، چاپی(١)، چاپخانەی(دار العلم للملایین) بیروت،(١٩٨٠).

٦. فاروق الشوشه: احلی(٢٠) قصائد فی شعر العربی، چ(١)، م دار العوده، بیروت(١٩٨٠).

٧. د. عزالدین مصطفی رسول: الواقعیة في الادب الكردي، چ(١)، م بیروت




# سەمای شیعر لەبەستەڵەکی ژووروودا
# قسەکردنێك لەسەر شیعری (شەونوێژی نامۆیان)ی عەبدوڵلا پەشێو

جەبار سابیر

مرۆڤ تێکەڵەیەکە لەسروشتو هەستی مرۆڤانەی خودی خۆی، سروشت کاردانەوەی سایکۆلۆژی سەنگین لەسەر مرۆڤ دادەنێت بەڕادەیەك کەسروشت کۆنترۆڵی هەموو بوونو کەینونەی مرۆڤی کردووە، ئەمەشە واله مرۆڤەکات زۆر گرێدراوی سروشت بێت بەجۆرێك خۆی بکاتە قوربانی، وەك چۆن بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی هەمیشە مرۆڤەکان لەپێناوی زێدو نیشتمانی خۆیاندا جەنگاونو شەهید بوونو بەردەوامیش مرۆڤ ئەو ئامادەییەی زیاتر لادروستدەبێت. لێرەدا هەردوو لایەنی جەستەییو رۆحی مرۆڤ ئەم ئامادەییە دەسازێنن، چونکە مرۆڤ تالەڕووی سایکۆلۆژییەوە ئاوێتەی سروشت نەبێت ناتوانێ وەك جەستە بەناو ئەو سروشتەدا بگەڕێتو گەشتو سەیران سازکاتو ناوچەیەکی کوێستانی بەداروو درەختو گوڵو گژوگیا رازاوە بکاتە شوێنی حەوانەوەو پشوودانی خۆی.

گەر بۆکەسێکی ئاسایی نیشتمان تەنیا شوێنی ژیانو مردنێکی ئاسایی بێت، ئەوا بۆکەسێکی ئەندێشمەندو خاوەن پرۆژەو بەرنامە بۆ خزمەتی نیشتمانو کۆمەڵگەکەی نیشتمان ماناو تێگەیشتنی زۆرترەو تەنیا بۆ مردنو ژیانە ئاساییەکە نییە. ئەمەش لەوەوە هاتووە ئەوکەسەخاوەن هەستە دەیەوێت بەهرە لەژیان وەرگرێتو نیشتمان لەڕووی سایکۆلۆژییەوە ئاسوودەیی بداتە ئەمو ئەمیش لەڕووی مادییەوە، وەك پرۆژەو پیلانی پێشەکەوتن خوازانە خزمەتی نیشتمان بکات. رەنگە بۆشاعیر سەختترین مەسەلە دووری بێت لەنیشتمانو زێدی لەدایك بوون، چونکە شاعیران کەسانێکی هەستیارنو زیاتر سۆز بەسەریاندا زاڵە، هەمیشە لەگریانێکی بەردەوامدان بۆ منداڵیو نیشتمان، شاعیر دەڕواتو لەدوای خۆیەوە نیشتمانو منداڵی جێدەهێڵێ. ئالێرەوە دەکرێت قسەلەسەر شیعرێك بکەین کەشاعیرێك نوسیوێتی زیاتر لەسی ساڵە ئاوارەو پەڕاگەندەیەو لەتاراوگەدەژی، کەهەر لەسەرەتاوە ئەوەمان لادروستدەبێت کەشاعیر هەرچی بنوسێت ریشەکەی دەچێتەوە سەر خۆشەویستی نیشتمانو گەڕانەوە بۆمنداڵیو بۆ زەمینێك کەلێوەی هاتووە.

(شەونوێژی نامۆیان) ئەو شیعرەیە کەدەمانەوێت لێیبدوێین، ئەم شیعرە خاوەنەکەی( عەبدوڵلا پەشێوە)و لەمۆسکۆ نوسراوە، کەئەوکات شاعیر ماوەی چەندساڵێکە لەوشارە دەژی، زەمەنی بڵاوبوونەوەو خوێندنەوەی لەلایەن خوێنەرەوە زۆردواکەوتووەو، دوور لەهەرجۆرە موجامەلەو حەماسەتێك دەکرێت وەك یەکێك لەشیعرە جوانەکانی کورد لێی بڕوانین. ئەکرێت ناونیشانی شیعر یاهەر کارێکی تری ئەدەبی کلیلێکی باش بێت بۆ کردنەوەی دەرگاکانی شیعرو دۆزینەوەی کۆدەکانی ئەو تێکستەی کەلێی دەدوێین. نوێژ لەکورتترین لێکدانەوەو شیکردنەوەیدا مانای نزیك بوونەوە لەوکەسە یاخود لەوشتەی کەدەتەوێت یادی کەیتەوە، چونکە دەبێت ئەوەمان بیرنەچێت کەبۆخۆی نوێژ یادکردنەوەو دواندنی کەسێك یاشتێك دەگەیەنێ. وەك چۆن لای ئیسلام رۆژی پێنج جار نوێژی فەرز مانای پێنج جار یادکردنەوەو دواندنی خودا، پاڕانەوە لەخودا بۆئەوەی بیپارێزێتو یارمەتی بداتو گەرکرا دوای مردنی بیخاتە ئەو بەهەشتەی خۆی بەڵێنی پێیداوە. بەنەبوونی ئەوشتانە لەکەسی موسوڵماندا لەهەموو ئەوشتانە بێبەشدەبێت کەپێشتر لێی دواین، بۆیە لای شاعیریش هەروایە گەر رۆژانە یادی نیشتمانەکەی نەکاتو بەخەیاڵو لەتەقسێکی سۆفییانەدا نەیدوێنێ ئەوکاتە نیشتمان باوەشی بۆناکاتەوەو لەیادەوەری خۆیدا هەڵیناگرێت، کەهەموو هەوڵی ئینسانی نووسەرو شاعیرو ئەوانەی خۆیان بەبابەتێکەوە سارقاڵکردووە بۆئەوەیە لەیادەوەری نیشتماندا بمێننەوەو ببنە بەشێك لەمێژووی نیشتمانەکەیان. (شەونوێژی نامۆیان) واتا ئەم شیعرە کاریگەری شەوی زیاتر بەسەرەوەیە ئەویش بەوەی کەسی تاراوگەنشین لەشەودا تەنیاییو نامۆیی زیاتر باڵی بەسەردا دەکێشێت، لەڕۆژدا ئاپۆرای خەڵكو چوونەدەرەوەو گەڕان لەفەزایەکی فراوانتردا خەمی دووری نیشتمانو نەبوونی هاوڕێو هاودەم لەبیردەباتەوە، بەڵام هەرهێندەی شەوداهاتو ئینسان بەرەو ماڵ گەڕایەوە ئیتر تەنیاییو نامۆییو خەمو خەفەت یەخەی دەگرێت، ئیتر ئەمە لەهەرگۆشەیەکی دنیادا وایە تەنانەت لەناوماڵو نیشتمانی خۆشتدا هەروایە بەڵام لەتاراوگەو دوور لەیارو نەیار ئەو وێنەیە تۆختر دەبێتەوەو ئینسانی شاعیر هەموو شەوێکی بەساڵێك لێدەڕوات.

لەڕوانگەی(هیپۆلیت ئادۆڵف تاین)ەوە قسەکردن لەسەر هەرکارێکی ئەدەبی دواجار قسەکردنیشە لەسەر خاوەنی بەرهەمەکە ئەو دەڵێت( بۆئەوەی بەوردیو دروستی لەبەرهەمێکی ئەدەبی بگەین دەبێ هەم لەتێکست هەمیش لەنوسەر بکۆڵدرێتەوە.) بۆئێمە پەشێو شاعیرێکە رۆچوو بەناخی نیشتمانو نەتەوەداو تەواوی بەرهەمی ئەوپیاوە لاواندنەوەی نیشتمانو سروشتو خەڵکی نیشتمانەکەیەتی، بۆیە ئەوەندەی باسی شیعرەکە دەکەین دەکرێت باسی شاعیریش بکەین، ئەم شیعرەشی گریانێکی بەخوڕە بۆنیشتمان، کەلێی دوورەو ئەمیش هەرچی شتێك ببینێت پێیوایە ریشەکەی لەنیشتمانی خۆیدایە. ئەوکاتەی ئەم شیعرە نوسراوە(١٩٧٩) چەند ساڵێکە شۆڕشی کورد نوشوستی هێناوە تازە لەسەرەتای دەسپێکی شۆڕشێکی تردایە، واتا ئەو دەمە کورد

بەسەختترین قۆناغدا تێدەپەڕی، شاعیریش بەهۆی نەبوونی هۆکانی پەیوەندییەوە بەدەگمەن هەواڵی پێدەگەیشتو دەیتوانی هەواڵی خۆی بنێرێ. لێرەشەوە تاکە پەناگەی ئارام بۆ شاعیر شیعرەو لەڕێگەی شیعرەوە خۆی لەو سۆزو هەستە خاڵیدەکاتەوە کەبۆ نیشتمان هەیەتی، واتا لەنەبوونی کەسی دووەمدا ئەم شیعر دەکاتە کەسو قسەی خۆی بۆ دەکات شیعریش وەك هەمیشە بەدەنگییەوە دەچێتو لەتوێی وشەو دێڕەکانیدا هەستو نەستی ئەمی شاعیر تۆماردەکاتو بەدرێژایی سەردەمەکان هەڵیدەگرێت.

**لەهەر جێیەك چیاببینم/ دڵم/ وەك لەژوانی یەکەمدا،/ دادەخورپێ، رادەچڵەکێ،/ سەرسام دەوەستم لەبنیا../ واتێدەگەم،/ لەچیای منرا دەست پێدەکەن/ چیاکانی هەموو دنیا!** دەکرێ سەرەتا لەخورپەوە دەست پێبکەین کەحاڵەتێکی زۆر دەگمەنەو زیاتر کەسێك باوەڕی پێیەتی کەزۆر عەشقی شتێك یا مەسەلەیەك بێت وەك لایەنێکی سۆفیگەری یان عارفانە باوەڕی تەواوی پێی هەبێت، پەشێویش ئەوەندە لەیادەوەری نیشتمانو سروشتی نیشتمانەکەیدا دەژی بەبینینی چیاوکانی کەدووسمبوڵی مانەوەو جوانی نیشتمانەکەی خۆیین دڵەخورپەی پێدەکەوێت. کوردو چیا پەیوەندیەکی رۆحییان پێکەوە هەیە، بەجۆرێك کورد مانەوەی خۆی دەبەستێتەوە بەبوونی چیاکانەوە پێشی وایە تاچیابمێنێ کوردیش دەمێنێ، هەزاران ساڵە بەهۆی چیاکانەوە خۆی لەبەردەم هێرشی داگیرکەرانو دوژمنانیدا راگرتووەو بەردەوام لەکاتی لێقەومانو هەڵاتندا چیاکان سنگی رەقیان بۆ کورد بۆتە باوەشێکی نەرمو ئاوەڵاو داڵدەی کوردیان داوە، هەرئەمەشە وای لەکورد کردووە کەتەنیا چیاکان بەهاوڕێو پشتیوانی خۆی بزانێت، ئەمە لای بیانییەکانیش سەلماوەو یەکێك لەو رۆژنامەنووسانەی سەردانی ناوچەکەمانی کردووەو لەسەرکوردیان نوسیوە وتویانە کورد جگەلەچیاکان پشتیوانی تری نییەو تەنیا چیاکان هاوڕێی کوردن. یاخود ئەوان لەنوسینی خۆیاندا دەڵێن لەهەرکوێ چیا دەستیپێکرد کوردستانەو کوردەکان ئامادەن خوێنی خۆیانی لەپێناودا برژن، بۆیە ئاساییە کورد هەمیشە بەبینینی چیا خۆشحاڵو شاگەشکەبێت.

ئاییەکان گرنگییەکی زۆریان بەئاوداوە لەژیانی ئینساندا، بەرادەیەك لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە(وجعلنا من الماء كل شيء حي) واتا هەمووشتێك لەئاو دروستبووە بەخودی ئینسانیشەوە، دواتر زانستیش سەلماندوێتی کەجەستەی ئینسان چەندە پێویستی بەخوێنە ئەوەندەش پێویستی بەئاوەو هەرئاویش پێکهێنەرێکی سەرەکی جەستەی ئینسانە. گەربچینەوە سەر ئەو قسە نەستەقەی کورد کەدەڵێ ئاوو ئاوەدانی، ئەوە تێدەگەین کەهەرئاوەدانییەك بەبێ ئاو هیچ ناگەیەنێ، یان بەمانایەکیتر بێ بوونی سەرچاوەیەکی ئاو ئاوەدانی دروستنابێت، چونکە هەمیشە مانەوەی ئینسان بەئاوەوە بەندەو کوردیش بەهۆی ئاوێتەبوونی لەگەڵ سروشتدا زۆرگرێدراوی ئاوو سەرچاوەکانی ئاوە، سەرباری ئەوەش کوردستان زیاتر ناوچەیەکی کوێستانییەو سەرچاوەی ئاوی زۆرە، ئەمە رەنگە هەر بۆکورد وانەبێت بەڵکو شتێکی سەراپاگیرەو ئینسان هەمووی وایە، هەرسەیرانگەیەك ئاوی لێنەبێت نابێتە سەیرانگەو کەس روویتێناکات. بەڵام گرفتی کورد هەرئەوەنییە بەتەنیا بەڵکو ئەوەشە کەلەئاوی کانیدا پاکیو بێگەردی دەبینێتەوەو پێیوایە ئەوەتەنیا ئاوی کانییە دەتوانێ تینوێتی ئینسان بشکێنێ.

ئەمی شاعیریش ئەوەندە گرێدراوی نیشتمانەکەیەتی کەهەرئاوێك ببینێ بێ گوێدانە ئەتەکییەتو رەچاوکردنی دابو نەریتی مۆسکۆ وەك خۆی دەڵێ بینی پیوە دەنێ، بین پێوەنانیش حاڵەتێکی سادەو ساکاری خەڵکی گوند نشینی گوندە کەلەسەر کانییەکە رادەکشێو دەم بەڕووی ئاوەکەوە دەنێو تاتینوێتی دەشکێ ئاو دەخواتەوە، لێرەدا دەکرێ ئەوە ببینینەوە لەپەشێودا کەپێمان دەڵێت من هەرکوڕە سادەو ساکارەکەی (بێرکۆت)مو لەخۆم نەگۆڕاوم. ئەو پێیوایە ریشەی ئەم ئاوە گەرلەکوردستانیش نەبێت ئەوا شیرناوەکەیان لەسەرچاوەی ئاوەکانی نیشتمانەکەیەوە دێ.

**لەهەر کوێ کانی ببینم/ دڵم/ وەك لەژووانی یەکەم/ دادەخورپێ، رادەچڵەکێم/ پێش ئەوەی بینی پێوەنێم،/ لەبەردەمیا/ بەهێمنی چۆك دادەدەم،/ قەوزەی سەری،/ وەك شابسکی شۆڕە ژنێك،/ شانە دەکەم،/ چونکە من وام بەبیردادێ،/ کەشیرناوی گشت کانیەکان/ لەنیشتمانی من رادێ!** گەر وردتر لەم وێنە شیعرییە کورتە بڕوانین ئەوسا پەی بەناسکی شیعرەکەو سەلیقەی شاعیرەکە دەبەین لەوەی چۆن بابەتەکان لەیەکتر نزیك دەخاتەوەو بۆ خاڵی هاوبەشییان دەگەڕێت. کانی یاخود ئاو هۆی بەردەوامی ژیانە، ئینسان رەنگە بتوانێت دەستبەرداری هەموو ئەوشتانە بێت کەلەسروشتدا هەن ئیتر خواردەمەنی بێت یاخود شلەمەنی، ئەتوانێ گۆشت نەخوا وەك چۆن لەئێستادا دەیان دەستەو گروپ هەن بوونەتە رووەکیو وازیان لەخواردنی گۆشتو چەورییەکان هێناوە، هەیە هیچ شلەمەنیو شەربەتێك ناخوا بەڵام کەس ناتوانێ واز لەخواردنەوەی ئاوبێنێتو ئاونەخواتەوە، لێرەوە ئەوەمان دەستدەکەوێ کەئینسان بێ ئاو هەڵناکات، واتا ئاو بەردەوامی دەدات بەژیانی زیندەوەران کەئینسان سەروەرییانە. دواتر قەوزەی سەر کانییەکە بەشابسکی ژن دەچوێنێ، واتا کانیو ژن لای پەشێو دەبنە یەكو بەردەوامی بەژیانی ئەم دەدەن، ژنیش وەك کانی هۆی بەردەوامیو مانەوەی ژیانی ئینسانە بەتایبەت بۆ پیاو کەهەرگیز بێ ژن هەڵناکاتو لەدوای ئاو تینوێتی پیاو ژن دەیشکێنێ.

سادەیی لەوشەو رستەداو قوڵی لەڕوانینو ناوەرۆکدا پایەیەکی سەرەکی سەرکەوتنی هەرشاعیرێك پێکدەهێنێ، تەمومژ خوێنەر لەهەرنوسینێك دووردەخاتەوە چجای ئەو نوسینە شیعربێت، کەشیعر بۆخۆی جەماوەریترین ژانری ئەدەبییەو خەڵکی سادەو خەڵکی نوخبەش دەیخوێننەوەو هەریەکەو بەجۆرێك چێژی لێوەردەگرن. پەشێو هەر لەسەرەتاوە تادەمی ئەمڕۆش بەسادەیی دواوەو ئەوسادەییەش ئەوی گەیاندۆتە ئەو پایەیەی ئێستا لەشیعری کوردیدا هەیەتی. فرناندۆ دی سوسور پێیوایە( قسەی شاعیر لەسیستمێکی نیشانەیی جیاواز لەگەڵ سیستمی

بەكارهێنراوی ئاخێوەرێكی ئاساییەوە سەرچاوە دەگرێ.) واتا ئەوەی شاعیر دەیڵێ ریشەكەی دەگەڕێتەوە سەر وتنەكانی كەسێكی ئاسایی، هەمان قسەی كەسێكی ئاساییە بەڵام بەجۆرێكیترو جیاواز لەگرامەرو ڕێسازمانییەكانی كەسی ئاسایی، چونكە دەبێ باوەڕمان بەوەهەبێ كەشیعر ملكەچی گرامەر نابێت بەڵكو گرامەرو زمان بەگشتی ملكەچی شیعرن و لەكانی شیعر ئاوەدەخۆنەوە، زۆر وشە لەزمانی ئاخاوتنی خەڵكدا بیردەچنەوە بەڵام جارێكیتر شاعیر دەیانهێنێتەوە نێوزمان.

**سەرمای گەلێك شارانم دی،/بەڵام پەنجەم لەگۆنەچوون،/ چونكە سەرمای هەموو جێیەك/ تیشكێك ڕۆژی/ نیشتمانی منی تیایە.گەرمای گەلێك شارانم دی،/ بەڵام گیانم وەڕس نەبوو،/ چونكە گەرمای هەموو جێیەك/ سروەیەكی/ نیشتمانی منی تیایە.** سروشتی ئینسان وایە بەگەرمای زۆرو سەرمای سەختیش هەراسان دەبێت، بەڵام رەنگە بۆ ئینسانی عاشق سەرماو گەرماش كاریگەری نەبێت چونكە عەشق ئینسان دەكاتە دەروێش و وای لێدەكات تەحەمولی هەرئازارو دەردەسەرییەك بكات. پەشێویش عاشقی نیشتمانەو هەست بەسەرمای بەستەڵەكی ژووروو گەرمای هەندێك ناوچەی ترناكات كەپێشتر لێی ماوەتەوەو تیایدا ژیاوە. ئەمەش لەوەوە هاتووە كەشاعیر واهەستدەكات سەرماو گەرمای ئەو شوێنانەش تیشكی ڕۆژو سروەكەی نیشتمانەكەی خۆی تێدایە كەكوردستانە، كوردستان وەكلایەنی سروشتی وڵاتێكە هەرچوار وەرزەكەی ساڵی تێدا دروستدەبێت بۆیە خەڵكەكەی هەم بەسەرماو هەم بەگەرماكەشی رادێن، بەڵام وڵاتێكی وەكو مۆسكۆ كەئەم شیعرەی تێدا نوسراوە ساڵ دوازدەی مانگ بەفرو كرێوەیە، كەڕەنگە بۆ ئینسانێكی ڕۆژهەڵاتی زۆری بوێت تالەگەڵ ئەو بەستەڵەكەدا هەڵبكات.

لای سوكرات (چاو چرای لەشە) لەش یاجەستە ئەشكەوتێكی تاریكەو چاو رووناكی دەكاتەوە، بەگشتی جەستەی ئینسان چاو تەواوكەرییەتی، ئینسان رەنگە بتوانێ بێ دەست و قاچ درێژە بەژیان بدات و چێژ لەژیان وەرگرێت، بەڵام بەبێ چاو ئینسان ژیانی بەزەحمەت لێدەگوزەرێ و چێژیش لەژیان وەرناگرێت. سەرباری ئەوەش چاو سەرنج راكێشترین بەشی جەستەی ئینسانە وەك چۆن ئینسان لەچاوەوە دەبینێ، بەهەمان شێوەش لەچاویشەوە دەبینرێ، هەمیشە گەركچێك بییەوێ لەكوڕێك بڕوانێ سەیری چاوی دەكات، بۆ كوڕیش هەروایە بەر لەهەرشتێك چاوی كچەكە دەبێتە جێگەی سەرنجی. هەرچاویش جوانی ئینسان دیاریدەكات، وەسفی ئینسانیش بەبێ ناوهێنانی چاو هیچ ناگەیەنێت و ناگاتە تەواو كۆیی. چاویش رەنگی رەش و شین و سەوزو قاوەییشی هەیە كەزۆرجار بەهەنگوینی ناوی دەنێن، لەناوچە ساردەكاندا چاوشین و سەوز زۆرن و بەدەگمەن چاوی قاوەیی و رەش دەبینرێت، بەپێچەوانەشەوە لەناوچەگەرمەكانی وەك وڵاتی خۆشمان چاوی شین و سەوز كەمەو دەبێتە جێی سەرنج.

**چاوی كیژی ئەوروپایی/ گەر شینیش بێ خۆشم دەوێ/ گەرسەوزیش بێ خۆشم دەوێ/ واتێدەگەم/ شینترین چاو،/ سەوزترین چاو/ لەم دنیایە/ تۆزێك رەشی/ چاوی كچی/ نیشتمانی منی تیایە!** لەڕوانگەی زانستەوە سۆمای چاو یان بینایی لەدوو ئاوی رەش و سپی پێكهاتووە، بەنەمانی یان كەمبوونەوەی هەر یەكێكیان چاوی ئینسان توشی گرفت دەبێ، سەرباری ئەوەش لەهەر چاوێكی سەوزو شینیشدا ئەو دوو ئاوە هەرهەن و لێرەشەوە ئەو دەربڕینەی پەشێو دەچێتەوە سەر لێكدانەوە زانستییەكە كاتێك پێیوایە لەهەر چاوێكی سەوز یا شیندا تۆزێك رەشی چاوی كچی نیشتمانەكەی ئەمی تێدایە. لەسەرەتای نوسینەكەدا وتمان ئەو ساڵەی ئەم شیعرەی تێدانوسراوە بۆ كورد زۆر سەختبووەو ئەمی شاعیری ئاوارەش جەستەی لەوێ و رۆحی لێرەبووە، بۆیە بەهیچ شتێكی ئەوێ رانایات و هەمیشە خەیاڵی دەیهێنێتەوە بۆ ئەمێندەر، پێیوایە چیاكانی هەموو دنیا لێرەوە دەست پێدەكەن و ئاوی كانیاوەكانی هەموودنیا لەكانیاوەكانی كوردستانەوە هەڵدەقوڵێن و سەرماو گەرمای هەمووندنیاش ریشەكەی لێرەوەیەو دواتر بۆیە كچە چاوشین و سەوزەكانی مۆسكۆشی خۆشدەوێ چونكە تۆزێك رەشی چاوی كچانی كوردستانەكەی خۆی لەچاوی ئەواندایە، ئەمە رەنگە لای هەندێك وەك مەیلێكی شۆڤێنیستی لێكبدرێتەوە بەوەی سەرچاوەی هەموو شتەكان بۆ كوردستانەكەی خۆی دەگێڕێتەوە، بەڵام بۆشاعیرێك كەهێندە گرێدراوی وڵاتەكەی خۆیبێت دەبێت هەروابێ.

هەموو هەوڵی پەشێو لەم شیعرەدا بەرهەم هێنانی گوتارێكە لەمەڕ ناسنامەی خۆی، بەڵام ئەم وەك نەتەوە بیردەكاتەوەو وەك نەتەوەش دەدوێت بۆیە ئەو گوتارەی بەرهەمیدێنێ گوزارشت لەبۆچوونی كۆی نەتەوە دەكات. **نیشتمانم/ تۆ وەك تانەی لەسەر چاوم/ تۆ وەك تەمی،/ لەگشت لاوە دەوروەت داوم/ تۆ ئاوێنەی/ لەناو تۆدا هەموو دنیا بەدی دەكەم،/ تۆ تەیمانی/ بەهۆی تۆوە هیچ نابینم/ نەكەل دەبینم، نەزەوی/ نەخوادەبینم، نەئاسمان/ جانازانم/ نەجیهان وەك تۆ بچوكە/ نەتۆ گەورەی بەقەد جیهان/ نیشتمانەكەم كوردستان.** پەشێو نیشتمانی لێبۆتە تانەو نەبۆی دەكرێ لەگەڵیدا هەڵكات و نەلەدوری ئەویش هەڵدەكات، نیشتمان وەك تەم دەورەی دەداو هیچ نابینێ، لێیدەبێتە ئاوێنەو هەموو دنیا لەكوردستانەكەی خۆیەوە دەبینێ. بەهۆی وێرانی كوردستان و بێكەسی كوردەوە نەخوا دەبینێ نەئاسمان و نەكەل دەبینێ نەزەوی، رەگی ئەم شیعرە پێدەچێت بچێتەوە سەرشیعرێكی كورتی كەهەر لەو ساڵانەدا نوسراوە كاتێك دەڵێ: چاو مەگێڕە بۆ ئاسمان و ئەستێرەو خوا/ ئەوی بستێك خاكی نەبێت خواو ئەستێرەو ئاسمانی كوا.

# قومار لەسەر کەرکوک قومارە لەسەر دوارۆژی هەموو کوردستان



*قسەیەکی زۆر لەسەر دیباجەی دەستووری ئامادەکراوی عێراق دەکرێ، کە مەزهەبیو ئاینییەو بەهەموو شێوەیەك هەوڵدراوە خۆی لە باسکردنی دەسکردێتی عێراقو، بوونی کوردو کوردستانو مێژووی پڕ چەوساندنەوەی ئەو دەوڵەتە دووربگرێ. بیروڕای ئێوە چییە لەو بارەیەوە؟

-پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانتان بدەمەوە، پێویستە ئەوە بڵێم، کە بۆ بابەیەکی وەك منی کوردستانی ئاسان نییە باس لە شتێك بکەم کە هەر لە بنەڕەتدا باوەڕم پێی نەبێ. من هەموو ئاواتم هەڵوەشاندنەوەی ئەو وڵاتانەیە کە بەناهەق نیشتمانی منیان داگیرکردووە. لەوەتەی خۆم ناسیوە، قەناعەتم وابووەو ئێستاش هەر وایە، کە نەتەوەیەکی سی-چل ملیۆن کەسی نابێتە خاوەنی کەرامەتی خۆی تا دەوڵەتی سەربەخۆی نەبێ. یا دەبێ، بەلای کەمەوە، لەگەڵ دراوسێیانیدا دەوڵەتێك لەسەر بناغەی یەککگرتنێکی ئارەزوومەندانە بنیات بنێ. ئەگەر لە ریفراندۆمێکدا گەلی کوردستان بەرژوەندیی خۆی لەوەدا دیت لەگەڵ ئەو گەلانەدا بژیت، ئەوسا باس لە دەستوور دەکرێ، کۆنتراکتێك یا گرێبەستێك لەنێوان دوو گەلو دوو ناوچەی جوگرافیدا. بنەمای ئەو گرێبەستەش یەکسانیی لایەنەکانی فیدراسیۆنەکە دەبێ. لە حاڵەتی پێکهێنانی دەوڵەتی عێراقدا، نە پێویست دەکا عەرەب بێتە هەولێرو دەست لە کورد پان بکاتەوە، نە کوردیش بچێتە بەغدا سواڵی هەندێ مافی سادەو ساکاری خۆی بکات. هاوسەنگیی تایەکانی تەرازووی بەرژەوەندی دەبێتە تاکە فاکتۆری سەرگرتنی گرێبەستەکە.

ئەو دەستوورەی ئێستا تەپڵو دۆڵی بۆ لێ دەدرێ، ئەنجامەکەی هەر دروستکردنەوەی عێراقێکی وەك عێراقی جارانە. دیسان خەڵکی کوردستان برا گچکەنو عەرەبیش برا گەورەن. دیسان کەس لە گەلی باشووری کوردستانی نەپرسی ئاخۆ دەیەوێ لەگەڵ عەرەبدا بژی، یا نا. دیسان عەرەب لە مەرکەزی بڕیارەو کورد لە پەراوێز، دیسان نیشتمانی کورد کەسایەتیو تایبەتمەندیی دیار نییەو لەناو دەوڵەتێکدا تواوەتەوە کە بەشێکە لە وڵاتانی گەلی سەردەست (ئەو وڵاتانەی بەرجەستەن لە جامیعەی دەوڵەتانی عەرەبیدا). دیسان گەلی باشووری کوردستان (بەکردەوە) بەبەشێك لە نەتەوەیەکی تر دانراوە.

ئەو هۆکارانەی وایان کرد لەماوەی هەشتا ساڵدا عێراق ئارامی بەخۆیەوە نەبینێ، لە عێراقی بەناو تازەشدا هەمان هۆکار هەن. یەکەم هۆی سەرنەگرتنی دەوڵەتی عێراقی ئەوەیە، عێراق دەوڵەتێکی نسادە (مرکب)یە. بریتییە لە کۆمەڵێك پێکهاتەی ئیتنیو ئاینیو مەزهەبیی جوودا جوودا. هەریەك لەو پێکهاتانەش قوڵاییی هەیە لە دەرەوەی سنووری عێراقدا. ئەگەر عێراق خۆی بەبەشێك لەهەر یەکێك لەو قووڵاییانە دانێ، ئەوا پرنسیپی یەکسانی تێکدەچێ. کورد قایل نابێ عێراق بەشێك بێ لە "نیشتمانی عەرەب"، هەروا سوننە قبوڵ ناکا عێراق بەشێك بێ لە جیهانی شیعە... هتد.

نازانم ئەو هەموو سووربوونەی عەرەب لەسەر عرووبەی عێراق لە سۆنگەی چییە! کە سوور دەزانن گەلانی تری بەعێراقەوە لێکنراو عەرەب نین؟! ئەوان قایل دەبن، عێراق بەشێك بێ لە کوردستان؟ ئەدی بۆچی دەبێ کورد بەوە قایل بێ عێراق بەشێك بێ لە عەرەبستان؟! خۆ لە هەموو دنیادا، کە فیدراسیۆنێك پێکدێ، کەس باسی هەرێمی گەورەو بچوك ناکا! هەمویان یەکسانن.

نازانم، کەس بیستوویە، نەمساوییەکان بڵێن نەمسا بەشێکە لە ئەڵمانیای گەورە، چوونکە هاوزمانن؟ خۆ پەیوەندی نەمساو ئەڵمانیا زۆر بەهێزترە لە هی عێراقو مۆریتانیا، یا لوبنانو

سوودان!

ئایا گەلانی بەلجیك قایل دەبن بەوەی وڵاتەکەیان خۆی بەبەشێك لە فەرەنسا بزانێ هەر لەبەر ئەوەی بەشێك لە بەلجیکەکان فەرەنسی زمانن؟! ئەرێ وڵاتانی ئەمریکای لاتین، کە زۆربەی هەرە زۆریان ئیسپانی زمانن خۆیان بە بەشێك لە وڵاتی ئیسپانی دەزانن؟! ئەو قسە قۆڕە هەر ناسیۆنالیزمی فاشستی تا سەر ئێسقان عەفلەقی دەیڵێ‌و دەیڵێتەوە، ئەویش هەر بەئامانجی تواندنەوەی گەلی کوردستان. جارێکی تریش دەیڵێمەوە: تا عێراق خۆی بەدەوڵەتێکی عەرەبی دابنێ، قەت‌و قەت ئاسوودەیی بەخۆیەوە نابینێ. قەت‌و قەت! دەبوایە سەرکردایەتی کوردستان، بێپەناو پێچ، ئەو هەقیقەتە لە مست لایەنی عەرەبی بنێ، بۆ ئەوەی ئێمەش‌و ئەوانیش بتوانین بەئاسوودەیی بژین. لەمێژە کاتی ئەو موجامەلە سەخیفانە بەسەرچووە کە دەیان ساڵە جگە لە کارەسات‌وماڵوێرانی هیچیان لەجێ شێ نەبووە. بەو راستگۆییە ئێمە دەتوانین نەك هەر خۆمان لە درۆیەکی گەورە رزگار بکەین، بەڵکو عەرەبیش. ئاشکرایە، کە عەرەبی عێراقیش ئەوەندە خۆشییان لەو برایەتییە نەدیوە!

یەك لە هۆیەکانی ئەو هەموو نەهامەتییانەی تا ئێستا تووشمان هاتوون، نەبوونی دابونەریت‌و کولتووری موفاوەزات یا گفتوگۆی سەرکردەکانی کوردە لەگەڵ بەرامبەرەکەیاندا.

سەرکردەی حیزبەکان، لە سەردەمی خەباتی شاخ‌و شاردا، ئامادەن تەنانەت لەگەڵ موختاری گوندێکیش دانیشن‌و گفتوگۆ (موفاوەزات) بکەن. هەمیشە مەسەلەی خاك‌و نەتەوەیەکی بندەستیان بەدەمەقاڵێیەکی ناو یەك خێزان زانیوە. بەیاساو رێسای نوسوولی دیوەخان جووڵاونەتەوە. ماچو موچ‌و رەفتاری نارەسمییانە بەشێك بووە لەو کولتوورە دواکەوتووە خێڵەکییە. گفتوگۆ هەمیشە لەماڵی دوژمن کراوە، هەمیشە دوو قۆڵی بووەو هیچ دەسگەیەکی بیانی یا نێونەتەوەیی بەشداریی تێدا نەکردووە. هەموو شتێك زارەکی بووەو کەم قەڵەم‌و کاغەز بەکارهاتووە. هەمیشە سەرکردەکان خۆیان، وەك ئینسکلۆپیدیست (موسوعی)، هەڵگری هەموو فایلەکانی گفتوگۆ بوونە. بەدرێژایی مێژوو ماوەی مفاوەزاتە عاجباتییەکانی سەرکردایەتیی ئەو حیزبانەن هەر بۆ ئەوە بەکارهاتووە، کە حوکومەتە تازەکانی عێراق دەستیان (بەقەولی شێخ زانا!) لە حوکم رابێ، چەك‌و تفاقی شەڕ پەیدا بکەن، هاوپەیمانی تازە بدۆزنەوە، دەرمز بخەنە ناو ریزەکانی کورد، ئینجا بەمێژوو گوڕێکی تازەوە بکەونە ریزەی شارو گوندی نیشتمانەکەمان. بەداخەوە، سەرکردەکان، دوای رووخانی سۆڤیەت‌و هاتنە پێشەوەی هەلومەرجی تەواو تازەش، بەخۆیاندا نەهاتنەوە. موفاوەزاتە شەرماوەرەکانی ساڵی نەوەدو یەك‌و ئەوانەی پاشتریش باشترین نموونەن.

حیزبەکانی باشووری کوردستان، هەر بەرواڵەت نا، بەڵکو بەراستی عێراقین. لە بەرنامەکانیاندا جارێ عێراقچییاتی خۆیان داوە. خۆیان لەکەس نەشاردۆتەوە. میدیاکانیان تەلاقیان دەکەوێ ئەگەر ووشەی کوردستان بەبێ (هەرێم)و (عێراق) بەکاربێنن. ئیتر رۆژی هەزار جار ئەو خەڵکە هەژارە نەخوێندەوارە ناچار دەکەن لەباتی وشەی سووك‌و ساناو شیرینی کوردستان، بڵێن: (حکومەتی "هەرێم!" واهات‌و وا رۆیشت، سوپاسی حکومەتی "هەرێم!" دەکەین کە مووچەی داینێ، کە تانکییەك ئاوی بۆ ناردین! کە رێگەی داین بێینە سەیران! کە ئەوەندە کتێبەی بۆ فلان قوتابخانە بەرێ کرد! هەرێم‌و هەرێم‌و هەرێم...).

خۆ ئەگەر کەسێك بەرێکەوت ووشەی کوردستانی لە زار دەرچێ ئەوا یەکسەر ناچاری دەکەن دوای کوردستان (عێراق)یش بەکاربێنێ. لەم بوارەدا رۆڵی کۆنە ستالینی (نەك کۆمۆنیستی کوردستانی)و کۆنەجاش‌و کۆنە بەعسییەکانی ناو میدیای کوردی وەك مانگ دیارەو حەوجە بەئەنگوست ناکا، هێڵی ئەوان زاڵە بەسەر هێڵی ئەو رۆژنامەنووسە پاکانەدا، کە هێشتا تاکو تووك لە میدیاکاندا ماون‌و کۆڵ نادەن.

جارێکیان سەرکردەیەك لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەیەکی عەرەبیدا گوتبووی: (حتی لو فرض الانفصال علینا لرفضناه. واتا: (ئەگەر جیابوونەوە بەسەریشماندا بسەپێنرێ هەر رەتی دەکەینەوە). بەم دوادواییەش هەندێکیان تەنانەت خەوبینینیش بەسەربەخۆیی کوردستان بەرەوا نازانن. کەسیش نییە پشتی ملیان بگرێ‌و لێیان بپرسێ: ئەی لە پێناو چی دەیان ساڵ کوڕی خەڵکتان بەکوشتندا؟ لە پێناو چی هەزاران گوندی کوردستانتان بەوێرانکردن دا....؟!

سەرکردایەتی حیزبە کوردییە عێراقییەکان، هیچ کاتێك‌و لەژێر هیچ هەلومەرجێکدا، بیر لە هیچ ئەڵتەرناتیڤێك ناکەنەوە غەیری خۆبەستنەوە بەدەوڵەتی داگیرکەری عێراقەوە. گەر ئەوان مەبەستی راستەقینەیان نەك هەر سەربەخۆیی، بەڵکو فیدراڵی بەراستیش بوایە، ئەوا لە ساڵی ١٩٩١ەوە چەندان جار هەلومەرجی ناوەکی‌و دەرەکی لەبار بووە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیفاکتۆی وەك ئەبخازیاو کۆسۆڤۆو چەندانی تر.

لە ١٩٩١ەوە دەسەڵاتدارانی کوردستان دەیانتوانی گەلێك لە سەرخان‌و بنخانی ئەو دەوڵەتە دیفاکتۆیە، یان ئەو هەرێمە فیدراڵە دانێن، وەك: کۆکردنەوەی هەموو ناوچە ئازادەکان لەیەکەیەکی ئیدارییدا، پێکهێنانی لەشکرێکی یەکگرتووی کوردستانی، هەڵبژاردنی پەرلەمانێکی راستەقینەی کاراو فرەڕەنگ، سازکردنی حوکومەتێکی پرۆفێشناڵ، دانانی دەستوورێکی هاوچەرخ، هەڵکردنی ئاڵا (وەك تاکە سیمبولی هەموو گەلی باشووری کوردستان)، چەسپاندنی وشەی کوردستان‌و نەپرینگانەوە لە بەکارهێنانی، برەودان بەزمانی ستاندارت و لێك نێزیککردنەوەی دیالێکتەکان لەرێگەی میدیاو پەروەردەوە، دانانی کۆڕی زانیاری‌و دەزگاکانی تری رۆشنبیری، دانانی سیستەمی پۆست‌و بانکی

ناوخۆی کوردستان، بەهێزکردنی هۆیەکانی هاتوچۆ لەنێو شارو گوندەکانی کوردستانو جۆشدانی بیری سەربەخۆییخوازی، بنیاتنانی سەرەتای کۆمەڵگەیەکی مەدەنیو دەستەبەرکردنی ئازادیی ژنانو... هتد. ئەمانەی من دەیانڵێمو زۆر شتی تریش دەستکردی خەیاڵ نین. ئەگەر ئیرادەی سیاسی هەبایە ئەمانەو زۆر دەستکەوتی دیکەش کاری کردە بوون. ئەگەر تا ساڵی ٢٠٠٢ ئەو شتانە بکرابانایە، ئەوا دواتر ئامادەییمان تێدا دەبوو پێ بنێینە قۆناغی هاتنی ئەمریکا بۆ ناوچەکە، جێیەکی دیارترمان دەبوو لە پرۆژەی (رۆژهەڵاتی ناڤینی گەورە). ئەمریکا پێویستی بەهاوپەیمانی بەهێزە.

بەڕاست، چما رێککەوتنی واشنتۆنی ١٩٩٨ بنەما نەبوو بۆ کیانێکی دیفاکتۆ؟ داوا لە کورد نەکرا لە نێوان خۆیاندا لەسەر حکومەتێکی هاوبەش رێککەوتنو پەرلەمانێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن ئەمە بکەنو ئەوە بکەن؟!......

ئەمەش لەکوێ؟ لە پایتەختی گەورەترینو بەهێزترین دەوڵەتی دنیاو بەشایەدیی وەزیری دەرەوەی ئەو وڵاتە! کەچی، تائێستاش، هەروا کۆبوونەوە دەکەنو باسی زەحمەتیی میکانیزمی یەکگرتنەوەی هەولێرو سلێمانی دەکەن! وەك بڵێی میکانیزمی یەکگرتنەوەی ئەو چەند شارە بەدبەختە، لەڕووی ئیدیۆلۆژیو ئابووریو سیاسیو فەرهەنگییەوە، زەحمەتتر بێ لە یەکگرتنەوەی دوو دەوڵەتی زلی وەك ئەڵمانیای رۆژئاوا لەماوەی چەند سەعاتێکدا!!!!

پاش ئەو پێشەکییە، با بێمە سەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکانتان:

پرسیارەکەتان دەربارەی دیباجە بوو.

دیباجەی دەستوورەکە، وەك زۆر کەسی تریش ئاماژەیان پێ کردووە، دەقێکی ئەدەبییە. کۆکتێلێکە، هەر پێکهاتەیەك بەشی خۆی ئاوێتە کردووە. بۆ خەڵکی کوردستان، هیچی تێدا نییە کە شایانی باس بێ. باسی ئەنفالو هەڵەبجە کارەساتی بارزانیو فەیلییەکان، ئەمانە کارەساتی گەورەن، بەڵام وەك چەند دیمەنێك، چەند رووداوێکی پچڕ پچڕی وەك شارۆچکەی دوجەیلو راگواستنی خەڵکی گوندی بەشیرو سەرکوتکردنی راپەڕینی شەعبانی ١٩٩١ی باشووری عێراق باسیان کراوە. نەدەبوایە وابێ. ئەوەی تائێستا بەسەر خەڵکی کوردستان هاتووە، سیاسەتێکی پلانڕێژی سیستەماتیکی رێکوپێك بوە، دەوڵەتی عێراق، هەر لەساڵی ١٩٦١ەوە، بەکاری هێناوە بەمەبەستی تەعریبو ژینۆسایدی خەڵکی کوردستان. دیباجەکە خۆی لە گەوهەری مەسەلەکە پاراستووە، کە تەعریبو ژینۆسایدو تێکدانی ژینگەو وێرانکردنی هەزاران گوندە. ئەوانەی رەشنووسی ئەو دەستوورەیان داڕشتووە دەزانن چییان کردووە! ئەو حیسابە قانوونییەی بۆ تەعریبو راگواستنی زۆرە ملیو ژینۆساید دەکرێ بۆ چەند دیمەنو رووداوێکی پچڕپچڕ ناکرێ، با رووداوەکان گەورەش بن.

جگە لەمانەش، لە دیباجەدا نە هیچ حیسابێك بۆ کورد کراوە وەك نەتەوە، نەبۆ کوردستانیش وەك چەمکێکی جوگرافیو دیرۆکی. هیچ ئاماژەیەکی دوورو نێزیکی تێدا نییە بۆ مافی چارەنووس، کە گرنگترین مەسەلەی پێکەوە ژیانی ئارەزوومەندانەیە. ئەو سنوورە دەستنیشان نەکراوە کە سیستەمی فیدراڵی تێدا بەرقەرار دەکرێ. دەبوایە هیچ نەبێ مادەی سێیەمی دەستوورەکەی عەبدولکەریم قاسم بچەسپێنن کە دەڵێ: (کوردو عەرەب هاوپشکن لەم وڵاتەدا).

من وەك چۆن قانوونناس نیمو ئەوەی دەیڵێم بیروڕایەکی سیاسییە نەك قانوونی، هەرواش من مێژووناس نیم، بەڵام بایی ئەوەندە ئاگادارییم لە مێژوو هەیە، کە بزانم ئەو عێراقەی لە دیباجەدا باسی دەکرێ (عێراقی حامورابی) عێراقی ئەمرۆ نییە (عێراقی موقتەدا سەدرو لە خۆدانی عاشوورا).

عێراقی ئەمرۆ لەڕووی قەبارەی جوگرافیو پێکهاتەی دیمۆگرافییەوە عێراقێکی ترە. ئەو عێراقەی هەیەو دەستووری بۆ دادەنرێ تەمەنی نامۆبارەکی هەشتا ساڵە. دەبوایە باسی ئەو عێراقە بکرێ کە دوای شەڕی جیهانیی یەکەم بەزۆر دروست کرا. باسی ئەو مێژووە بکرێ چۆن کەمینەیەکی رەگەزپەرستی مەزهەبخوازی میلیتاریستی (عەسکەرتار) نەخوێندەوار دەستیان بەسەر هەموو شتێکدا گرتبوو. چۆن هەشتا ساڵی رەبەق، لە دەوڵەتێکی فرەنەتەوەدا، بیری رەگەزپەرستانەی یەك نەتەوە سەردەست بووە...

***کورد بەشداری دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقو نووسینەوەی دەستوورەکانی عێراقی نەکردبوو لەرابردوودا، ئەوە نازێکی کورد بوو لەسەر مێژوو، گلەیەکی قانوونی بوو، کەچی ئێستا بەشدارە لە نووسینەوەو دەنگدان لەسەر دەستوورێك کە مافی چارەی خۆنووسینی نەداوە بەکورد ئەوە چۆن لێکدەدەیەوە؟**

-وەك پێشتریش گوتم، رەشنووسی دەستوور هیچ ئیشارەتێکی دوورو نێزیکی بۆ مافی چارەنووس تێدا نییە. جگە لەمەش تا ئێستا بەدۆستی دوژمنمان دەگوت: (عێراق دەوڵەتێکی دەستکردەو بەزۆر بەشێکی کوردستانیان پێیەوە لکاندووە)، ئەدی لەمەولا بڵێین چی؟! بڵێین چی، کە خەڵکانێك بەناوی کوردەوە بەشداری لە دامەزراندنەوەی دەوڵەتی داگیرکەری عێراقدا دەکەنو دەستووریشی بۆ دادەنێن؟ زەمانەتێکتان بۆ خەڵکی کوردستان پێیە کە دەوڵەتی عێراق سبەی خراپتریشمان پێ ناکا؟!

***وەك بایەخپێدەرێکی زمان چۆن دەڕوانییە مەسەلەی زمانی کوردی لەو رەشنووسی دەستوورەدا؟**

-مەسەلەی زمان، بۆ گەلی کوردستان یەکێکە لە مەسەلە هەرە بنچینەییەکان. زمان نیشانەی هەرە دیارو بەرجەستەی جوداکردنەوەی کوردە لەنا کورد. لە دەستدان یان لاوازکردنی ئەو نیشانەیە مەودای ئینکارکردنی کورد لەلایەن دراوسێکانییەوە

فراوانترو تەختتر دەکا. بیری نەتەوەییی عەرەبی لەسەر بنچینەی زمان هەڵچنراوە. واتا، عەرەبایەتی رەگەزو خوێنو رەنگی پێستو شتی لەم بابەتە نییە، بەڵکو رۆشنبیرییە. شادەماری رۆشنبیرییەکەش زمانی عەرەبییە. ئەم پرنسیپە هەر لە رۆژانی یەکەمی ئیسلامەوە پیادە کراوە تا دەگاتە ساتیع حوسەریو عەفلەقو ئەلیاس فەرەحو بنلادن. لەبەر ئەوەی عەرەبی زمانی قورئانی پیرۆزە، ئەم فەلسەفەیە کاری کردووەتە سەر عەرەبی رەمەکیش. چی هەیە سوودانییەکی رەشپێستو قژ زەردێکی لبنانیو ئەسمەرێکی یەمەنی بەیەکەوە ببەستێ زمانی عەرەبی نەبێ؟! ئاخۆ ئەوەی عەرەب پێی دەڵێ (نیشتمانی عەرەب) لەرووی ئیتنییەوە چەندی عەرەبە؟

من لەگەڵ عەرەباندا خوێندوومەو دۆستو برادەری باشیشم لەناویاندا هەن. بەگوێرەی تاقیکردنەوەی خۆم، بۆم دەرکەوتووە، کە عەرەبێك قەت لە دڵەوە ناتوانێ تۆ بەناعەرەب قەبووڵ بکا، ئەگەر بەعەرەبی لەگەڵیدا بدوێی. ئەو ناتوانێ لەوە بگا کە تۆ عەرەبی وەك هەر زمانێکی بێگانە دەزانیت، نەك وەك زمانی دایك. هیچ مەرجیش نییە ئەمەی لەپیاو خراپی بێ. بەڵکو زۆرجار ئەو عەرەبایەتیت وەك شەرەف پێ دەبەخشێو دەیەوێ بەمە گەورەت بکا. ئەو نازانێ برینداریت دەکا، لەلیبیا چەندان جار لەگەڵ برا عەرەبەکانمدا، کە باشەکانیان بوون، تووشی کێشە دەهاتم. لەسەر چی؟ تەنیا لەسەر ئەوەی لەگەڵ منداڵەکانی خۆمدا بەکوردی قسەم دەکرد. دەیانگوت تۆ عەرەبی لە ئێمە باشتر دەزانی، بۆ بەعەرەبی قسە ناکەی؟ فەرقی چییە؟ منیش دەمگوت، بەخوا هیچ فەرقی نییە، دەئێوە، ماڵتان نەشێوێ، بەکوردی لەگەڵ منداڵەکانی خۆتاندا قسە بکەن!

حیزبی بەعس، بەئاشکرا لە پرۆگرامی خۆیدا هەموو ئەوانە بەعەرەب دادەنێ کە بەعەرەبی دەپەیڤن. عەرەب کەمینەیەکی داگیرکەری باکووری ئەفریقا نەبوو؟ ئەمرۆ، دوای سەپاندنی زمانی عەرەبی بەسەر ناعەرەبەکاندا، باکووری ئەفریقا بەبەشێکی دانەبڕاوی "جیهانی عەرەبی" دادەنێ، ئەو جیهانەی لە "موحیت"ەوە دەست پێ دەکاو لە "خەلیج" بەکۆتایی دێ (بەکوردستانی ئێمەشەوە).

ئەگەر کورد بیەوێ خۆی بەگەلێکی جودا لە عەرەب دانێ، دەبێ پێش هەموو شتێك، پێ لەسەر زمانی شیرینی خۆی دابگرێ. دەبێ زمانی عەرەبی، ئەگەر پێویستی کرد، وەك هەر زمانێکی بێگانە بناسێو بزانێ. پرۆگرامی خوێندنو هۆیەکانی راگەیاندنو سەرچاوەکانی رۆشنبیری بکوردێنرێ... هەریەك لەو مەسەلانەی سەرەوە پێویستییان بەلێدوانی تایبەت هەیەو باوەڕ ناکەم سەرکردایەتی کورد ئاگای لەو کەربازارییە بێ کە رۆشنبیریی کوردی بەگشتیو زمانی کوردی بەتایبەتی دووچاری هاتون.

لە ماددەی چوارەمی رەشنووسی دەستووردا دەڵێ:

(زمانی کوردیو عەرەبی دوو زمانی رەسمین....) ئەمەیان باشەو هەنگاوێکە بۆ پێشەوە. بەڵام نابێ دڵخۆش بین. چونکە کە لە برگەیەکی تری هەمان ماددەدا بەکارهێنانی زمانی عەرەبی لە "هەرێم"دا دەکاتە مەرجێك بۆ ئەو نووسراوانەی پەیوەندییان بەبەغداوە هەیە، بەهەموو وەزارەتو دامودەزگاکانییەوە! لێرەدا تێدەگەین کە هاوسەنگیی زمانی کوردیو عەرەبی درۆیەو ئەو یەکسانییەی لە دیباجەو میباجەدا باسی کراوە کەس بەقروشێك نایکرێ. زمانی کوردی هەر زمانی برا بچووکەکەی جارانە. هەر ئەو زمانە پاشکەوتووەیە، کە بەبێ دارشەقی زمانی عەرەبی ناتوانێ هەنگاو هەڵبێنێ. خۆشمان هەر وای دادەنێین.

من ترسم هەر لە برگەیەکی دەستوور نییە، ترسی گەورەم لە جێبەجێکردنی لایەنی باشی ماددەکەیە، نەك هەر لەلایەن دەوڵەتی مەرکەزییەوە، بەڵکو پێش هەمووان لەلایەن کورد خۆیەوە.

کە تەماشای رەوشی ئێستای زمانی کوردی دەکەین، کاتێ لەو هەموو نەهامەتییانە ورد دەبینەوە کە لە ساڵانی دواییدا تووشی هاتووە، نائومێدی دەمانگرێ. ئێمە ١٣ ساڵە نەك هەر نەمانتوانیوە زمانی خۆمان یەك هەنگاو ببەینە پێش، بەڵکو خەریکین ئەوەش وێران دەکەین کە وەچەکانی پێش خۆمان بەکوێرەوەری دروستیان کرد.

ئیتر چی لە ماددەیەکی سەقەتی ناو دەستوور بکەین؟ ئەمرۆ تۆ دەبێ بەچرای گەرچەك، لە هەموو میدیای کوریدا، بەدوای رستەیەکی رەوانی کوردیدا بگەڕێی. ئەو رێنووسەی کە هەبوو خەریکە لە بەین دەچێ. رۆژی دەیان وشەی نامۆ بەزمانی کوردی لەلایەن خەڵکێکی نەخوێندەوارەوە دروست ئەکرێن. رۆژنامەگەری بووەتە کاسبیەکی حەرام. دوو سێ تەلەفزیۆنی عەنتیکە هەن، کە لەسەر حیساباتی هەژارانی کوردستان دامەزراون، هەرچی زمانی دنیاو دیالەکتیكو وشەی عاجباتی کوردی هەیە لەوان دەیبیسی. بابەتی ئەو تەلەفزیۆنانە زۆر تایبەتەو بەدەیان بەرگ کتێب تەواو نابێ. باوەڕ ناکەم لە مێژووی رۆژنامەگەریی دنیادا عاجباتیی وا هەبێ. زمانی کوردییان سووكو چرووك کردووە. کار وا بڕوا، تا چەند ساڵێکی تر ئەوەی هەیە ئەویش دەڕوا.

بانگەشەی بەکارهێنانی ئەلفوبێی تورکی، لەباتی ئەو ئەلفوبێیەی هەموو ئەدەبیاتی کوردیی پێ نووسراوەو سەدەیەك زێترە خزمەتمان دەکاو سازێنراوە لەگەڵ ستروکتووری فۆنێتیکی زمانی کوردی، مەترسییەکی ترە. ئەگەر خوێندەوارانی کورد بەئاگا نێنو جرتوفرتی کەمالیستەکان سەر بگرێ، ئەوا بەتەواوی ماڵمان وێران دەبێو دەکەوینە سەر ساجی عەلی. بەتایبەتیش ئەوانەی دەیانەوێ ئەو "ئەرك"ە جێبەجێ بکەن پسپۆری ئەو مەیدانە نین. جەمال نەبەزو تۆفیق وەهبی نین!

لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا کە بەعس نەماوەو بووینەوە بەعێراقی، کەس نییە هەست بەگەڕانەوەی زمانی عەرەبی نەکا بۆ ناو ژیانی رۆژانەی خەڵك. تەنانەت زمانی رۆشنبیرو

سیاسەتمەدارانی حیزبەکانیش گۆڕاوە. تۆپەڵ تۆپەڵ وشەو زاراوەو رستەی عەرەبی دەردەفرتێنن. ئەگەر کوردێك عەرەبی نەزانێ تێیان ناگا.

مامۆستایەك بێتە کوردستان بۆ دەرس گوتنەوە لە کۆلێژێکدا، دەبێ هەموو قوتابیانی کۆلیژەکە بەعەرەبی قسە بکەن، نەك مامۆستاکە خۆی فێری زمانی خەڵکی ئەو وڵاتە بکا کە هاتووە کاری تێدا بکا. تا ئێستا لە کوردستاندا هیچ یاسایەك نییە سەبارەت بەپێویستیی فێربوونی زمانی کوردی بۆ ئەو کەسانەی بۆ کارکردن روو دەکەنە کوردستان. یاسای وا لە هەموو دنیادا هەیە.

لە فینلاند تۆ ناتوانیت هیچ کارێك بکەی ئەگەر فینلەندی نەزانیت. لە ڕووسیا ئەو دووکاندارە سزا دەدرێ کە تابلۆی سەر دووکانەکەی بەغەیری زمانی رووسی بێ. لە هەموو دنیادا خۆراك، داودەرمان، ریکلام... هتد بەزمانی زگماکی خەڵکی وڵاتن. لە ئیستۆنیا، دوای رزگاربوونی لە داگیرکارانی شوورەوی، لەماوەی ١٢ساڵی سەربەخۆییدا، بەپێی دەستوورو کۆمەڵێك یاسا، هەموو شتێك کرایە ئیستۆنی. لەوێ، کە جاران هەموو شتێك بەڕووسی بوو، یەك تابلۆ نابینیت بەغەیری ئیستۆنی، لە باخچەی منداڵانەوە بگرە تا دوا قۆناغی خوێندن هەمووی هەر بەئیستۆنییە. بەکورتی ئەو چەند ساڵەیان بەکارهێنا بۆ ژیاندنەوەی زمان و کولتووری خۆیان.

لەبەر ئەوەی بەشی زۆری سەرکردەکانی ئێمە کوردی نازانن، خواخوایانە دەرفەتی قسەکردنیان هەبێ بەعەرەبی. ئەوان پاراستنی زمانی کوردی بەکاری خۆیان نازنن. ئەوان زێتر لە بەڕێوەبەری کۆمپانیا دەچن و عەوداڵی قازانجی کۆمپانیاکانیانن. زۆر جار بیرم لەوە کردۆتەوە، بۆ هەندێ لە سەرکردەکان خۆیان مەشغووڵی فێربوونی زمانی کوردی ناکەن؟ بۆ کەسێکی وەك عەزیز گەردی یان کوردیزانێکی تر بانگ ناکەن خولێکی زمانی کوردییان بۆ بکاتەوە؟

هەندێ جار کە گوێم لە سەرانی کورد دەبێ چ لەو زمانە شیرینە دەکەن، بەدڵ حەز دەکەم بەهەر زمانێکی تر قسە بکەن نەك کوردیی. ئەدی کاك حەبیب کەریم، کە دەیان ساڵ بوو لەناو پێشمەرگەی رەشوڕووتی کورد دەژیا، هەر بەعەرەبی قسەی نەدەکرد؟! کەی زانین و نەزانینی زمانێکی دواکەوتووی وەك کوردی ئەوە دەهێنێ پیاو بیزانێ؟!

زمانی کوردی یەکێکە لە زمانە هەرە دوڵەمەندەکانی دنیا. لەناو ٥٠٠٠ تا ٦٠٠٠ زمانی دنیادا یەکێکە لە ٤٠ زمانە گەورەکان. هیچی کەمتر نییە لە عەرەبی و تورکی و فارسی و هەر زمانێکی تر، زمانی کوردی زۆر شلکەو توانای پێشکەوتنی زۆرە.

کاتێ لە وڵاتێکدا چەند گەلی جیاجیا دەژین، بەچەند شێوەیەکی جیاجیاش مەسەلەی زمان چارەسەر دەکرێ. یەك لەو شێوانە ئەوەیە زمانی هەموو پێکهاتەکان لە سەرجەمی وڵاتدا رەسمی بێ، وەك لە فینلاند. زۆر جار باسی ئەزموونی فینلاندم کردووە. لێرە، سوێدییەکانی ئەم وڵاتە تەنیا ٦٪ خەڵکی فینلاندن. کەچی زمانی سوێدی، فینلەندی ئاسا، لە سەرانسەری وڵاتدا رەسمییە. هەر سوێدییەك دەتوانێ لەهەر کوێرە دێیەکی وڵاتدا بەزمانی خۆی بپەیڤێ و کاروباری رەسمیی خۆی جێبەجێ بکا. ئەگەر لەوێ تێی نەگەیشتن ئەوا ناچارن وەرگێڕ بێنن. هەر لە پەرلەمان و حکومەتەوە تا دەگاتە شوێنی بلیتفرۆشتن تۆ دەتوانیت بەهەر یەکێك لەو دوو زمانە قسە بکەی، یان کاروباری خۆت جێبەجێ بکەیت، لەهەر شارێك دەیان وەرگێڕ هەن. هەر کۆبوونەوەیەك، هەر کۆنفرانسێك ساز دەکرێ، بەو زمانە دەپەیڤێت کە باشتری دەزانیت و قسەکانت تەرجەمە دەکرێن.

لە فینلاند لە هەموو شارەکان، تەنانەت کۆڵان و گەرەك و ستۆپی پاس و چی و چی هەموویان بەدوو زمانن. هەر کاڵایەك دێتە ئەم وڵاتە بەگوێرەی یاسا دەبێ بەهەردوو زمان لەسەری بنووسرێ.

بەکورتی، ئەگەر ئێمە رێز لە زمانی خۆمان بگرین، ئەوا شتێکی کەمیش لە دەستوور دەقۆزینەوەو، ئەوپەڕی کەڵکی لێوەردەگرین. خۆ ئەگەر بەچاوی نزم سەیری کولتوورو زمانی خۆمان بکەین ئەوا هەزار ماددەی باشیش لە دەستووردا هەبن دادمان نادەن. ئێمە وەك گوتم، ١٣ ساڵ زێترە خۆمان حوکمی خۆمان دەکەین، کەچی قەت و قەت رۆشنبیری و خوێندەواری و زانست و زمان لەو رەوشە مەترسیدارەی وەك ئەمرۆ نەبوونە.

***هەستناکەی شیعەگەرێتی بەیاسایی کراوە لەو دەستوورەدا، وەك هەنگاوێك بۆ باڵکێشانی تەواوی لە ئایندەدا؟!**

-دەربارەی چەوسانەوەی مەزەبی، نازانم. مەگەر شیعەکان فێری سنگکوتان و لەخۆدان و ئەو جلوبەرگە رەشە دڵتوندکەرانەمان بکەن. مەگەر شایی و مۆسیقامان لێ قەدەغە بکەن! لە ئازادیی ژنانیش ناترسم، چوونکە ژن ئازادییان نییە تا لە دەستی دەن! کۆمەڵگەی ئێمە کۆمەڵگەیەکی نێرەکی (ذکوری)یە: یانەکان، چایخانەکان، سینەماکان، شەقامەکان، چێشتخانەکان، گەشتوگوزار، سەفەر، بزنێس، مزگەوت...هتد، ئەمانە هەموو بۆ پیاوانن. تالیبانی لای خۆمان چما چی بۆ ژن هێشتۆتەوە تا شیعە لێی بسێننەوە!

***کاتێ خۆی لە وتارێکتدا لە (میدیا)دا نووسیبووت راپرسیکردن لەسەر ئایندەی کەرکوك قومارکردنە لەسەر شارێکی کوردستانی و نەدەبووا قبوڵبکرێ و دووبارەکردنەوەی ئەزموونە هەڵەکانی رابردووە لەم دەستوورەش کە تاوەکو ٢٠٠٧/١٢/٣١ دانراوە بۆ چارەسەری مەسەلەی کەرکوك چۆن لێکدەدەیەوە؟**

-رێککەوتنی ١١ی ئازار بووە پێشینەیەکی پشتشکێن بۆ مەسەلەی کەرکوك.

هەڵگرتنی کێشەی کەرکوك بۆ چوار ساڵی ئایندە (١٩٧٠-١٩٧٤)و قایلبوون بەبڕاندنەوەو ساخکردنەوەی مەسەلەکە لەرێگەی سەرژمێرییەوە بووە بناغەی دڵەراوکێ و شلکردنی ئیرادەیی خەڵکی کوردستان و هاندانی داگیرکەران.

رازیبوون بەپرنسیپی سەرژمێری، یا راپرسی، مانای گومانەو دڵەراوکێیە. لە دەرگەدانی قومارخانەیەکە کە ئیحتیمالی بردنەوەو دۆراندنی تێدایە.

ئەگەر ٣٤ ساڵ پێش ئێستا، لە بارودۆخێکی ناوەکی و دەرەکیی زۆر جیاوازدا، سەرکردایەتیی کوردستان، لەگەڵ هەموو دڵسۆزییەکیشی بۆ مەسەلەی کەرکووک، بەناچاری ملی دابێ بۆ سەلماندنی سەرژمێری بۆچی دەبێ ئەمڕۆ، لە هەلومەرجێکی تەواو جیاوازدا، کەرکووک ببێتە کارتی قومارێك کە ئەنجامەکەی دیار نییە؟

قومار لەسەر کەرکووك قومارە لەسەر دوارۆژی هەموو کوردستان. لەم قومارە خەتەرناکەدا، ئەگەر نیسبەتی ئیحتمالی دۆراندن یەك لەسەر سەدیش بێ، هەر کارێکی ترسناکە.

لەسەرەتاوە، نەدەبوایە حیزبەکان مەسەلەی باشووری کوردستان وەك ئەم شارو ئەو شار رەپێش بکەن. زنجیرە چیای حەمرین هەمیشە سنوورێکی سروشتی بووە بۆ لێککردنەوەی عێراق و خاکی کوردان.

بۆچی جارێکی تر خۆمان تووشی قوماری ماددەی ٥٨ کرد؟

سێ ساڵ زێتر بەسەر رووخانی رژێمی بەعسدا تێپەڕیوە، کەچی هێشتا عەرەبە داگیرکەرەکان هەر لەسەر زەویی کوردانن و ئاوارەکانیش هەر لەبن خێوەتان بەزەلیلی دەژین. تا دێ زێترو زێتر عەرەبە داگیرکەرەکان متمانە بەمانەوەی خۆیان دەکەن و خەڵکی بێدیفاع و پشتگوێخراوی کەرکووک تێرۆر دەکەن.

دەبوایە، هەر لەگەڵ راماڵینی بەعس، داگیرکەرانی شارەکەش، کە پیاوی بەعس بوون، بەرەو وڵاتی خۆیان راماڵدرێن. ئەمە خەیاڵ نییە. لە رۆژانی یەکەمدا زۆربەی عەرەبەکان بەخواستی خۆیان دەیانویست دەرباز بن، بەڵام حیزبەکان لەڕقی یەکتر کەوتنە پشیپشی کردن بۆ سەرۆك عەشیرەتەکان و پسوڵەی (عدم التعرض)یان دانێ. لەولا داوەت دەکران و لەملا گونیان هەڵدەسەنگێرا، رۆژێك لە هەولێرو، رۆژێك لە سلێمانی بانگ دەکران و باسی دیموکراسی و مافی مرۆڤو قانوون و قەرەبووکردنەوەیان لەگەڵ دەکردن، بەمەش هانیان دان بمێننەوە.

من باسی راماڵینم کرد. دەزانم ئەوانیش مرۆڤن. بەڵام خۆ ئێمە نەچووینەتە سەر ماڵی ئەوان، ئەوان بەپێی خۆیان هاتوون و ماڵی هەزارانی کوردو تورکمانیان داگیرکردووە. ناکرێ ئەوان لەوە نەگەیشتبن بۆچی هاتوون! جگە لەمەش، ئەدی ئەو کوردانەی دەرکرابوون و ساڵەهای ساڵ ژیانی زەلیلییان لەبن خێوەتان بەسەر دەبرد، ئەوانیش مرۆڤ نەبوون؟ من لەگەڵ ئەوەدام قەرەبوو بکرێنەوە، بەڵام ئەوە موشکیلەی کورد نییە. ئەوان دەتوانن بچنەوە وڵاتی خۆیان و لەوێ داوای قەرەبووکردنەوە بکەن و کوردیش پشتیان بگرێ.

ئێمە دەبوایە ئەوە بکەین کە ئەبخازییەکان بۆ شاری سوخومی کردییان. ئەوان، کە یەکەم هەلیان بۆ هەڵکەوت، گەرماوگەرم یەك گورجییان لەشاری سوخومی نەهێشت و وەدەریان نان. ئیتر نیشتەجێکردنەوەو قەرەبووکردنەوەی ئاوارەکان بووە ئیشی حکومەتی گورجستان خۆی. سەریشی گرت. ئێستا سوخومی پایتەختی ئەبخازییەکانەو با گورجستانیش هەر سیر بخواو زوڕنا لێدا!

هەر لەسەرەتاوە سەرانی کورد نەدەبوایە ئەو قومارە لەسەر کەرکوك بکەن. جوگرافیای وڵاتان وا دەستنیشان ناکرێ. گرنگ نییە چەند کورد، عەرەب یا تورکمان لە کەرکووك دەژین، گرنگ ئەوەیە ئەو شارە لە تانوپۆی جوگرافیاو مێژووی کوردستاندایەو لێی جودا نابێتەوە. جا خوای دەکرد سەد لە سەدی عەرەب یا تورکمان دەبوو. بۆچی ئەگەر شاری بەغدا هەمووشی ببێتە کورد عەرەب قوماری ریفراندۆمی لەسەر دەکەن؟ با دوور نەڕۆین، کە ئیستۆنیا لە رووسیا جوودا بووەوە، شارێکی وەك (نارڤا) کە زێتر لە ٩٥٪ نەوەدو پێنج لەسەتانی رووسن، هەر کەوتە سەر ئیستۆنیا. چونکە لەڕووی جوگرافی و مێژووییەوە هەمیشە شارێکی ئیستۆنی بووە. جا گرنگ نییە ئێستا کێی تێدا دەژی. هەر بەو پێیەش کورد نابێ لەگەڵ برا تورکمانەکان بکاتە مشتومڕ کێ زۆرینەیەو کێ کەمینە. خوای دەکرد کەرکووك سەد لەسەر سەدی تورکمان دەبوو، خوای دەکرد هەموو ئیدارەی کەرکووك لەدەست ئەوان دەبوو، بەڵام کەرکووك شارێکی کوردستانییەو تورکمانیش وەك خەڵکی کوردستان هەموو مافێکیان هەیە. لەو مافانەش ئیدارەکردنی ئەو شوێنانەی ئەوان زۆرینەیان پێکدێنن.

ئەگەر کوردستانێکی ئارامو ئازادو دێمۆکرات و گەشەکردوو هەبایە، ئەگەر دامودەزگای مەدەنی وڵاتیان هەڵسوڕاندایە، ئەگەر تەواوی بزنێس و دینامۆی ئابووری لە دەست مافیاکان نەبایە، ئەگەر دەسەڵاتی هەردوو حیزبەکە، یەك لە سەدی ئەوەی لە میللەتی دەدزن و پروپاگەندەی دواکەوتووانەی سەرف دەکەن بۆ کەرکووك تەرخان بکرابایە، رەوشی کەرکووك ئێستا بەشێوەیەکی تر دەبوو. تەنانەت برا تورکمانەکانیش شانازیان بەوە دەکرد بێنە پاڵ هەرێمێکی تێرو تەسەل و پێشکەوتوو. دەتوانین دەیان نموونە بێنینەوە بۆ راستیی ئەم بۆچوونە. چما رووسەکانی شاری (نارڤە)ی ئیستۆنی، کە پێشتر باسم کرد، رازی دەبن شارەکەیان بکەوێتە سەر رووسیا؟ نەخێر! چونکە ژیانیان لەگەڵ ئیستۆنیا ئارامترو تێرترە وەك لەگەڵ هاوزمانەکانیان لە ڕووسیا. چما زۆربەی خەڵکی وڵاتی ئەورووپای رۆژهەڵات، ئەگەر سەرپشك بن، نایانەوێ ببنە هەڤوڵاتی دەوڵەتێکی ئەورووپی رۆژئاوا؟ بێگومان گەلی تورکمانیش هەروا. بەڵێ،رەنگە کەسانێك هەبن، رەگەزپەرست بن، با سەر بە میتی تورکی بن، بەڵام ئەمانە کەمینەن. زۆربەی هەرەزۆری تورکمانەکان وەك ئێمە مرۆڤن و دەیانەوێ لە وڵاتێکی ئارامو پێشکەوتوودا بژین.

بەکورتی من هەر وەك پرەنسیپ باوەڕم بەماددەی ٥٨ نییە. وەك گوتم، ئەم ماددەیە قومارەو قوماریش ئەگەری دۆڕاندی تێدایە. دۆڕاندنی خاکیش وەك دۆڕاندنی شتێکی تر نیە، قەرەبوو بکرێتەوە. جگە لەمەش جێبەجێکردنی ئەو ماددەیە، بەغیابی لایەنی دەوڵەتی مەرکەزی، ئارادەیەك لەسەر سەرکردایەتی کورد خۆیەتی. بەڵام ئیرادەی دەوێو لەو سێ ساڵەی رابردووشدا، مخابن، هەست بەو ئیرادەیە نەکراوە.

***گفتوگۆکارانی کورد دەڵێن لەبەر ترس و دڵەڕاوکێی عەرەبەکان لە وشەی (فیدرالی) وشەی (اتحادی)مان بەکارهێناوە، باشە یەکێك ناوەکەی قبوڵ نەبێ چۆن حازر دەبێ ناوەڕۆکەکەی جێبەجێبکات؟**

-بەڵێ ، راست دەفەرمووی، وشەی (اتحادی) قەت هێزی (فیدرال)ی نییە. ترس لەم وشەیە مانای ترسە لە ناوەڕۆکی وشەکە!

***چۆن دەڕوانییە ئەو مەسەلە کە د. فوئاد مەعسوم گوتی بۆیە "جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤ" لە دەستووردا تەبەنی نەکرا چونکە هەندێك لە عەرەبەکان پێیانوابوو هەندێ لە ماددەکانی دژی شەریعەتی ئیسلامە؟**

-وەك پێشتریش گوتم، ئەم دەستوورە نە دەستورێکی سێکۆلار (علمانی)ە، نە دینییە. کۆکتێلێکی سەیرە. پێم وانییە ماددەیەکی تێدا بێ، دواتر بەماددەیەکی دەستەخوشکی پووچەڵ نەکرابێتەوە! چ لە دەستوورێك چاوەڕێ دەکەی کە بۆ وڵاتێکی فرە ئایین ئاینێك بکاتە رەسمی (ماددەی ٢)؟ بۆ وڵاتێکی فرە نەتەوەش زمانو رەچەڵەکی یەك لەو نەتەوانە بکاتە سەردەست (ماددەی ٣)؟ چ لە دەستوورێك دەکەی باس لە دامودەزگای مەدەنی بکا، کەچی بایەخیش بە بووژاندنەوەو پشتگیریکردنی خێڵو هۆز بدا (ماددەی ٤٣)؟

***بانگەشەی دەنگدان بەو دەستوورە لەنێو حیزبەکانی کوردستاندا لە ئاستێکی زۆر گەرمدایە، چۆن لەوە دەڕوانی؟**

-حیزبەکان هەقی خۆیانە بانگی خەڵك بکەن دەنگ بۆ ئەو دەستوورە بدەن. ئەوان، هەر لەگەڵ رووخانی رژێمدا، یەکسەر دابارینە سەر شارەکانی عێراقو سەرمایەیان لەوێ خستە گەڕو کۆشكو تەلارو دامودەسگاکانی رژێمیان داگیر کردو دەستیان بە (یا عێراق یا عێراق) کرد! ئەوان هەر لەسەرەتاوە، بێ ئەوەی هیچ رێککەوتنێك، یا گرێبەستێك، لەگەڵ لایەنی عێراقدا هەبووبێ، وەك چەند حیزبێکی عێراقی هەڵسوکەوتیان کرد.

ئەوان پێش دروستکردنەوەی عێراق کەوتن. هەڕەشەو چاوسوورکردنەوەو خۆگێڤکردنەوەی ناوە ناوەی سەرانی کورد هەر بۆ گەرمکردنی بازاڕی ناوخۆیەو هیچی تر، کە تۆ پێشوەخت بریارت دابێ بەشێك بیت لە وڵاتێکی ترو هیچ دەرگەیەکی دیت بەکراوەیی نەهێشتبێتەوەو بیرت لە بچووکترین ئەلتەرناتیڤ (بەدیل) نەکردبێتەوە، ئیتر لایەنی دڵنیای عێراقی چ باکی بەو هەموو هێڵە سوورانەی تۆ هەیە، کە جاروبار دیاندەنێ؟!

من رەخنە لە حیزبەکان ناگرم، ئەوان هیچ کاتێك باسی شتی تریان نەکردووە. ئەوان راستگۆن. ئەوان دوو حیزبی عێراقینو هیچکاتێك ئەمەیان نەشاردۆتەوە. کێشە لە ناهۆشیاری زۆربەی خەڵکەکەیە سەرکردەکانی ئێمە یەك رۆژ ناتوانن لەوڵاتێکی هۆشیار و خوێندەواردا حوکم بکەن.

هەڵبەتە، لە کوردستاندا، دەنگ بە (بەڵێ) بۆ دەستوورەکە دەدرێ. مەکینەی میدیای حیزبەکان دەکەوێتە شۆردنەوەی مێشکی خەڵكو چۆنیان بوێ وای ئاراستە دەکەن. جا با منو تۆ هەر لە گۆپی خۆمان بدەین! هەر سیر بخۆینو زوڕنا لێدەین!

***پێشکچی دەڵێ کوردستان لەخوار پلەی کۆلۆنی (مستعمرە)دایە چونکە سنوورەکانی بەیاسایی دیار نین، باشە ئەو دەستوورە لەو بارودۆخەی عێراقدا دەرفەتێك نەبوو بۆ چەسپاندنی ئەو مەسەلە گرنگە؟**

-بەڵێ دەرفەتێك بوو، بەڵام نەقۆزرایەوە. کە ئێمە هەر لە ئەساسدا بریاری عێراقیبوونی خۆمان دابێو هەمیشە بەغدامان بەپایتەختی خۆمان دانابێو کێشەکەمان هی ناو یەك ماڵ بووبێ، باسی کام کۆلۆنی (موستەعمەرە) دەکەی؟ جگە لەمەش تۆ "هەرێم"ت هەر لەسەر کاغەز هەیە. لە راستیدا دەسەڵاتێك لە سلێمانی هەیە، دەسەڵاتێکی تریش لە هەولێرو دهۆك. بەشێکی تری ئەو "هەرێم!"ە، کە زێتر لە ٤٠ لە سەتانی خاکی باشووری کوردستانە، لەبن دەستی عێراقە. بەشێکی کەمیشی لەدەست لەشکری تورکیاو چەند کیلۆمەترێکیشی پ. د. ك حوکمی دەکا. بەکردەوە خودی هەرێمەکە، وەك یەکەیەکی ئیداری، نییە تا بیکەین بەکۆلۆنی یا نەیکەین! تا ئەو دوو ئیدارەیە نەبنە یەك حکوومەتی راستەقینە، ئەوا ئێمە لە خراپەوە بەرەو خراپتر دەچین. ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ئێمە هێشتا یەك گەلی هاو چارەنووس نین، بەڵکو کۆمەڵێك عەشایرو گرووپو بەرەبابین. کۆلۆنی حاڵەتێکی پێشکەوتووترە لەوەی ئێمە. خەڵکی کۆلۆنی هەست بەیەکێتی چارەنووسی خۆیان دەکەن. هەست بەئینتیما دەکەن بۆ یەك خاك، یەك وڵات، یەك کولتوور، یەك مێژوو، یەك ئاڵا...هتد. ئێمە وانین. ئێمە لە سەردەمی بیستویەکەمدا لە هەرەتی شارچییاتیو دیالێکتچییاتیو حیزبحیزبانێداین. ئێمە، لەو کەرکووکەی بەقودسو دڵی دادەنێین، ئامادە نین لەسەر ناولێنانی قوتابخانەیەك یا کۆڵانێك رێکبکەوین. ئێمە زۆر لەو پەرتترین خۆمان بەخەڵکی یەك کۆلۆنی دانێین. ئەمەی من دەیڵێم قسەیەکی زۆر تاڵە، بەڵام پێویستە بگوترێ، پێویستە لێی ورد بینەوە، بۆ ئەوە نا کە ورە بەربدەین، بەپێچەوانەوە، بۆ ئەوەی خۆمان راست کەینەوە. خۆراستکردنەوە یەکەم هەنگاوی سەرکەوتنە.

***هەندێ کەس پێیوایە دوا رستەی دیباجەی دەستوور بەمانای مافی چارەی خۆنووسین دێت، لەکاتێکدا یەکێك لە یەکەمین ئەرك و دەسەڵاتەکانی حکومەتی ئیتحادی لە بەغدا پاراستنی (یەکپارچەیی) خاکی عێراق، هەروەها هەموو سوێند خواردنێك پاراستنی (سلامة الاراضی العراقیة)ە تێدایە؟**

-هیچ مادده‌یه‌کی ده‌ستووره‌که ئاماژه به‌وه ناکا، که دیباجه حوکمی ماده‌یه‌کی ده‌ستووریی هه‌یه به‌هه‌رحاڵ، من قانوونناس نیم، ناوێرم خۆم له‌و مه‌سه‌له قانوونییانه بده‌م. ئه‌گه‌ر راو بۆچوونێکیشم هه‌بێ، ئه‌وا سییاسییه نه‌ك قانوونی. به‌گشتی ئه‌و مافانه‌ی مادده‌یه‌کی ده‌ستوور ده‌یاندا، وه‌ك پێشتریش گوتم، مادده‌یه‌کی که‌ڵه‌گا له‌ولاوه دێ‌و زه‌وتیان ده‌کا! ئه‌مه نه‌ك هه‌ر به‌نیسبه‌ت دیباجه، به‌ڵکو به‌نیسبه‌ت زۆربه‌ی مادده‌کانی ده‌ستووره‌که. بۆ نموونه بڕگه‌یه‌کی مادده‌ی ١٣ ده‌ڵێ: (ئه‌م ده‌ستووره باڵاترین یاسای عێراقه، له هه‌موو شوێنێکدا بێ هه‌لاواردن کاری پێ ده‌کرێ) له بڕگه‌یه‌کی تردا ده‌ڵێ (نابێ هیچ یاسایه‌کی ناکۆك له‌گه‌ڵ ئه‌م ده‌ستووره ده‌رچێ، هه‌ر ده‌قێکیش له ده‌ستووری هه‌رێمه‌کاندا ده‌رچێ‌و له‌گه‌ڵیدا ناکۆك بێ پووچ ده‌کرێته‌وه). ئیتر ده‌بێ چ ئازادییه‌کمان هه‌بێ له دانانی ده‌ستووری "هه‌رێم"دا؟ ئایا ئه‌م مادده‌یه هیچ جێیه‌ك بۆ تایبه‌تمه‌ندییه‌کانی (هه‌رێم)ا ده‌هێڵێته‌وه؟

***زۆرجار ده‌گوترێ (...) ئای ئه‌مه وایه‌و راسته؟**

-ناوه‌ڵڵا وانییه! ئه‌مه یه‌کێکه له‌و قسه قۆڕانه‌ی خه‌ڵکی ساویلکه‌ی پێ چاوبه‌ست ده‌کرێ. سێ لایه‌ن هه‌ن ده‌یانه‌وێ گرێبه‌ستێك، یا کۆنتراکتێکی هاوبه‌ش ده‌رکه‌ن (شیعه‌و سوننه‌و کورد). هه‌ر یه‌که‌و به‌رگری له مافه‌کانی خۆی ده‌کات. عه‌ره‌ب، چ شیعه چ سوننه، چ مافێکی خۆی داواکردووه تۆی کورد رێت لێی گرتبێ؟ گوتووته نابێ زمانی عه‌ره‌بی زمانی ره‌سمی بێ‌و ده‌بێ کوردیش له ناوچه عه‌ره‌بییه‌کان به‌کاربێ؟ ئه‌وان ئه‌مه له‌سه‌ر تۆ فه‌رز ده‌که‌ن. تۆ دژی ئه‌وه‌ی ئه‌وان مافی چاره‌نووسی خۆیان به‌ده‌ست خۆیان بێ؟ نه‌خێر. ئه‌وان دژن. تۆ داوات کردووه عه‌ره‌ب به‌شێك بێ له نه‌ته‌وه‌ی کورد؟ نه‌خێر! ئه‌وان سوورن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی تۆو وڵاتی تۆ به‌شێکن له نه‌ته‌وه‌ی ئه‌وان‌و خاکی ئه‌وان. به‌کورتی، ئه‌وان مافی خۆیان داوا ناکه‌ن، به‌ڵکو ده‌یانه‌وێ مافی تۆ پێشێل بکه‌ن. هیچ مافێك نییه عه‌ره‌ب داوای بکا کورد دژی بێ.

ئه‌وانه‌ی هاتبوونه پیرمام، بۆ هاتبوون؟ خۆ نه‌هاتبوون به‌سه‌رکردایه‌تی بڵێن: (هاواره، ئێمه ده‌مانه‌وێ زمانی خۆمان وه‌ك ئێوه به‌کاربێنین، له ناوچه‌کانی خۆمان هه‌ر خۆمان خاوه‌ن ده‌سه‌ڵات بین، رومادی بخه‌نه‌وه سه‌ر ناوچه‌ی خۆمان، خێرو بێری ناوچه‌ی خۆمان بۆ خۆمان بێ هتد...) ئه‌وان بۆ شتێکی تر هاتبوون. هاتبوون، بێشه‌رمانه، بڵێن: (تۆ به‌شێکی له نه‌ته‌وه‌ی عه‌ره‌ب، ئه‌و شاخ‌و داخانه‌ی تۆ هه‌واکه‌یان هه‌ڵده‌مژیت به‌شێکن له وڵاتی عه‌ره‌بان‌و تۆ خۆشت میوانی له‌سه‌ر ئه‌م خاکه!) سه‌رکردایه‌تیی پیرمام نه‌ك هه‌ر ده‌بوایه میوانداریی ئه‌و عه‌فله‌قییه که‌لله‌پووچانه نه‌کا، به‌ڵکو، ده‌بوایه په‌لیان بگرێ‌و له پیرمام هه‌ڵیاندێرێ!

## سه‌رچاوه

**ڕۆژنامه‌ی (میدیا) ژماره ( ٢١٢) ساڵی ده‌یه‌م ١٩ی ڕه‌زبه‌ری ٢٧٠٥ی کوردی.**

## سه‌ربازی وون

که وه‌فدێ ده‌چێته شوێنێ
بۆ سه‌رگۆڕی سه‌ربازی وون
تاجه گوڵینه‌یه‌ک دێنێ
ئه‌گه‌ر سبه‌ی
وه‌فدێک بێته وولاتی من
لێم بپرسێ :
" کوانێ گۆڕی سه‌ربازی وون ؟"
ده‌ڵێم :
گه‌وره‌م :
له که‌ناری هه‌ر جۆگه‌یێ
له سه‌ر سه‌کۆی هه‌ر مزگه‌وتێ
له به‌رده‌رگای
هه‌ر ماڵێ
هه‌ر کلیسه‌یێ
هه‌ر ئه‌شکه‌وتێ
له سه‌ر زیناری هه‌ر شاخێ
له سه‌ر دره‌ختی هه‌ر باخێ
له کوردستان
له سه‌ر هه‌ر بسته زه‌مینێ
له ژێر هه‌ر گه‌زه ئاسمانێ
مه‌ترسه !
که‌مێک سه‌رداخه‌و
تاجه گوڵینه‌که‌ت دانێ !

**عه‌بدوولا په‌شێو**

عبدالله بشيو

# طأطئ بهامتك، وضع الإكليل

. مواليد ١٩٤٧ قرية " به ركوت"، التي أصبحت الآن جزءاً من هولير، كردستان.

. خرج من كردستان عام ١٩٧٣، إلى السوفييت.

. ماجستير في الترجمة (إنكليزي . روسي) من معهد موريس توريز، في موسكو، عام ١٩٧٩.

. حاصل على الدكتوراه في الأدب الكردي، من معهد الدراسات الشرقية في موسكو، عام ١٩٨٣.

. عمل استاذاً محاضراً حول الأدب المقارن في جامعة الفاتح في طرابلس الليبية.

. نشر أولى قصائده في جريدة أسبوعية، في هولير عام ١٩٦٣.

. أول عمل شعري مطبوع له عام ١٩٦٧، في مدينة كركوك.

. له ثمانية أعمال شعرية مطبوعة.

. ترجمت قصائده إلى اللغات: الروسية، الفنلندية، السويدية، الدانماركية، الأرمنية، الانكليزية، الألمانية، العربية. الفارسية، والتركية.

. مقيم في فنلندا منذ عام ١٩٩٥.

## المختارات

إن عثرتُ على تفاحة

إن عثرتُ على تفاحة،
**سأشطرها بالتساوي إلى نصفين:**
نصف لكِ، ونصف لي.
إن عثرتُ على بسمة،
سأشطرها بالتساوي إلى نصفين:
نصف لكِ، ونصف لي.
وإن عثرتُ على حزن،
سأكتمه عنك
واستنشقه بشَرَهٍ، كالنفس الأخير.
براغ ٣/ ١٩٨٣/١٢

**كنز**

منذ بدء الخليقة،
والانسان يعشق الجواهر واللآلىء،
يبحث عنها في قيعان البحار، وذرى الجبال،
أما أنا، فأعثر كل صباح على كنز،
حين أرى ضفائركِ المحلولة
تغطي نصف وسادتي.
أوديسة ١٩٨٩/٨/١٠

**ثريا وشمعة**

هناك من يكتب على ضوء ثريا باهرة،
ليجد دربه إلى قلب السلطان،
وآخر يكتفي ببقية شمعة
ليوقدها، ويعثر على الذات.
لذا، كلما قصدتُ قلمي،
أتمهل قليلاً، وأتأمل:
هذه ثريا، وتلك شمعة،
أيهما تشتعل في داخلي.
موسكو ١٩٨٤/٨/١٢

**عاصفة ثلجية**

هبت عاصفة
كانت الدنيا في غسق،
جعلتُ من كفي عشاً لندف ثلج مشردة،
حدقت بها كمغرم
حين ذابت، عرفتها:
في كردستان
كانت ذات يوم، قطرة في نبع.
12/1/1981

**تأملات**

تلك كانت البداية،
أشعل الفجرُ النار في أطراف ثوب السماء،
حشا مسامات روحي بهسيس اللهيب،
وبعث لي مع الشفق زاد السفر،
وأومأ باصبعه إلى دربي المتعرجة،
وها قد أقبل المساء،
وأدركني إعياء الطريق،
يلامس قامتي شحوب خافت،
أقف منغرساً في حومة العَرَق والغسق،
أرهف السمع إلى وقع خطوات النجوم،
ألمح ربوة مضببة، تحجب عني كوخي السرمدي،
لم تبق إلا خطوات، صعوداً،
وخطوات نزولاً.
لكن، كيف أخطو إليها
والأرض تمسك برسغي، التماساً لهبة؟!
أتأمل حائراً.
أية هبة سأقدمها للأرض، قبل الرحيل؟.!
موسكو ١٩٩٢/٧/١٣

**دوّار الشمس**

وطني: عش الشمس، وخميلة النور،
ورأسي زهرة عباد الشمس
تلك التي دائماً تدور.
13/ 4/1989 طرابلس

**ميلاد الرئيس**

كان ذلك في القرن الثالث عشر،
حين مرّ هولاكو بـ كردستان كالطاعون.
كان العصر مثل عصرنا
يفيض بالتكايا والدفوف والقباب
كان الشبع كنبتة الحمص، قزمة
والحزن فارعاً كمئذنة.
عندما أصاب هولاكو بغداد
وبنى إصطبلاً على أنقاض محراب
عندما أسند ترسه ورمحه
أهدته ساحرة من أهل المقبرة بيضة أفعى،
وفي وكر دامس، رطيب
رقدت عليها ذئبة مسعورة
وأخيراً
في القرن العشرين
فقست البيضة
ولاح رأس التنين.
10/ 3/ 1989 طرابلس

**إلى هادي العلوي**

في زمن يحكمه الأقزام
من أين لك قامتك الفارعة؟
في زمن دب فيه القحط
من أين لك هذا الموسم الأخضر؟
كيف سمعتَ أنينَ علي
وأنت محاصر بجلجلة حلي قريش، وصرير سيوفها؟
كيف جاءتك تأوهات ماريا القبطية

وندنة عائشة، وحفصة تصم الآذان؟.!
متحف
سوف ابني في كوردستان
اكبر متحف في أرجاء المعمورة
وليكن لكل عصر جناح
الأول اسميه:
" جناح عصر ماقبل التاريخ."
واكتب على بقية الأبواب
اجنحة الحِراب والمخالب والأنياب.
16/11/1988 طرابلس

**كم أخاف**

كم اخاف عندما اعود
ان تخبريني بشيء مر، غريب
كم اخاف، حين اضمك إلى صدري
ان يضوع منك رائحة عطر غريب.
كم اخاف، عندما اعود
ان احس بأن
قواعد لغة الأحداق
ومفاتيح الايماءات قد تغيرت
ودفء الأنامل لم يعد كما كان
بل اخاف اكثر
عندما اعود
ان تبقي انتِ، كما كنتِ
وانا يغيرني الزمان.
28/1/1980 فيينا

**الجندي المجهول**

عندما يذهب وفد ما إلى مكان ما،
يضع إكليلاً من الورد،
على نصب الجندي المجهول،
وإذا زار وفد ما وطني، وسألني:
. اين ضريح جنديكم المجهول؟!
سأقول له: ياسيدي
ضع إكليك على ضفة اي جدول
عتبة اي مسجد
باب اي بيت
اية كنيسة
في اي كهف
على صخرة اي جبل
وعلى شجرة اية حديقة، تريد
في كردستانتي..
فوق اي شبر من ارضها
وتحت اية بقعة من سمائها،
لاتهب، طأطىء هامتك خشوعاً
وضع إكليل وردك.

الترجمة عن الكردية: مجموعة من المترجمين، ومراجعة الشاعر

## نیازێکی کوردی

نیازم.. وابوو
بتکه م .. به چه پکه نێرگز
بۆ سه ر مێزم
له سه رمای شه وی زستانه
گه رمت کاته وه...ئامێزم!
نیازم..وابوو
ئه و سنگه ی سه رینی نازه
شه و..له سه ری بهۆ نمه وه
که زی ی زه ردی شیعری تازه!
نیازم..وابوو
پرچت بکه م به هێلانه
روومه تم تیا بدات ..نووچێ
گه ردنت بکه م به مۆمێك
له شه وانی هۆنراوه دا
بۆم رووناك كاته وا..سوچێ!
نیازم..وابوو
تا ئه و رۆژه ی
له یه کترمان ئه کا مردن
شادی...بکه م به گه ردانه
بینالێنه شووشه ی گه ردن!
نیازم..وابوو
بۆت ده زگیرکه م
ئه ستێره ی ئاسمانی زه به ند
په لکه زێرینه ت بۆ بگرم
بۆتی بکه م به که مه ر به ند!
نیازم..وابوو
گه ر به هاری ئه م جاره بێت
به ساپۆرتی ده ریازبوونی بسووتێنم

## له ده ستم دێ

له ده ستم دێ
کانزمێری کامه رانیت بوه ستێنم
له ده ستم دێ
ئه لقه ی په نجه ت پێ فرێ ده م
نامه ی به خه تت ،بسوو تێنم
له ده ستم دێ
هه موو شتێك ئاشکرا که م
کام شه وت گه ش و رووناکه
ئه و شه وه پف له چرا که م
له ده ستم دێ
به دوو ووشه
دڵی زاوای نوستوت....ره ش که م
له خۆشاوی
شه وی په رده تان ..بێ به ش که م
نا مه کانت
یه ك یه ك ماوون
دیاری یه ساده کانت
یه ك یه ك ماوون
چاویان شۆره
ده ست له سه ر سنگ بۆم وه ستاوون
له ناوی ئه و کاره ساته م
ئاره قه ی شه رم ئه تکێنن
مۆری حه زێکی ئاگرین
به ناو چاونه وه....ئه لکێنن
تاڵێکی پرچت نه ماوه
تێر تێر بۆنم نه کردبێ
جێ ی ده رزیه ك
له سنگی برسپت نه ماوه
په نجه م په ی پێ نه بردبێ

## CONDITION

No, I am not against dictators!
Let them multiply across the earth
Like the shadow of God.
But on one condition--
Let the children be dictators!

## THE FREE WORLD

The free world has listened for so long
To the pulse of oil deep in the heart of things
It has become humpbacked,
Stone deaf.
It doesn't hear the mountains burning.

## THE DAGGER

I am a bare dagger!
My Motherland is a stolen sheath.
Don't think I am bloodthirsty!
Go; find fault with the one,
Who unsheathed me!

## IF YOU WISH

If you wish your children's pillows
To bloom pink,
If you wish your gardens
To be fruitful,
If you wish heavy clouds
To send green messages to your fields
And raise the sleepy eyelids of spring _
Then liberate
Liberate the bird
That nests on my tongue!

## THE UNKNOWN SOL-DIER

If someday a delegate comes to my land
And asks me:
"Where is the grave of the Unknown Soldier here?"
I will tell him:
"Sir,
On the bank of any stream,
On the bench of any mosque,
In the shade of any home,
On the threshold of any church,
At the mouth of any cave,
In the mountains on any rock,
In the gardens on any tree,
In my country,
On any span of land,
Under any cloud in the sky,
Do not worry,
Make a slight bow,
And place your wreath of flowers."

## THE TREASURE

Since the beginning of the earth
Man has been seeking after
Pearls, gold and silver
Searching the depth o oceans
And the peaks of mountains.
But, every morning, I discover a treasure,
When I see your plaits
Covering half of the pillow.

## PARTING

Every night, when a pillow
Invites our heads
As the two poles of the earth
To the feast of sorrow,
I see the parting lies between us
Shining, Like a dagger,
I remain awake,
Staring at it.
Do you see it, as I do?

## LUSTRE AND CAN-DLE

Some need a magnificent lustre
To find the way to the Sultan's heart.
Some need a piece of a candle
For self seeing and self burning
Therefore, before taking up my pen,
I examine
What is lighting inside me:
The lustre, or the candle!

## POETRY

Poetry is a capricious woman
And I have fallen deeply in love.
Promising each day to come to me
She comes rarely, or not at all.

## IF AN APPLE ...

If an apple falls to my lot
I will cut it into two pieces:
One for me,
One for you,
If I win a smile, I will cut it into two pieces:
One for me
One for you.
If I come across grief
I will inhale it as deeply
As the last breath!

## IF I RETURN ONCE MORE

If I return once more,
In the mornings,
I will frolic in the lush fields like a lamb
I will chew a blade of bitter grass
And dampen my feet in the dew till I fall.

## If I return once more,

I will climb the nut-trees, like a squirrel.
Like a low cloud, I will drift over green meadows.
Like a sad willow,
I shall bow over streams,
Touching the stones on their banks tenderly.
Oh, only to return once more?

## If I return once more

With staring eyes I shall watch
How the heads of corn yellow;
How the apples and the pomegranates ripen,
How the birds make their nests;
How the young ones learn to fly;
How the migrant swallows sit in a row
On the telegraph wires;
Where brooks originate
And where they stream!

## If I return once more

I will drink a sip of water
From the breast of each spring
To make them all my mothers.
In every cave
I will lay my head on a stone each night
To make them all my cradles.

## If I return once more

I shall bring tongues of fire
To those who cannot speak.
I shall bring wings of fire
To birds which cannot fly.

## If I return once more

I won't allow the young to rip up flowers
To place in dead vases
I will teach them how to place them
On the breasts of their lovers
Before embracing them.

## If I return once more

I'll celebrate the birthdays of the children
Who have known no celebrations,
Instead of candles,
I shall burn my fingers
I shall burn the pupils of my eyes
I shall burn the youngest of my verses.

## If I return once more

I shall bow over any cradle
I come across
Ah, children, if only I return once more.

## I LOVE YOU BOTH

Since I'll only live once
I love both of you.
Since I'll only live once
I offend neither the sunray,
Nor the moonbeam!

## If I lived twice

I would have loved you in this life
And loved the other in that life.
Since I only live once,
I have no choice:
I love both of you.
I offend neither the sunray
Nor the moonbeam.

## SUNFLOWER

My Homeland--is the nest of the sun,
And the meadow, where rays bloom.
My head--is not a head,
But an ever-inclined sunflower!

## ON THE FUNERAL OF A POEM

My head was sea,
Thoughts, like small fishes,
Sank and floated till the morning,
I threw my net into the sea:
It fished a single.
And that one,
Turning from side to side, died!

## YEARNING

I am in a hurry
It is high time to get
Some leaves of trees,
Some blades of grass,
Some wild flowers from that land.
I am not afraid to forget their names
I am afraid to forget their fragrance.

## TO A COLD BEAUTY

I admit--you are beautiful,
Like a drop of dew on a petal.
I admit--you are a temple for every eye,
Like a drop of dew on a petal.
Yet still I am bored with you,
As if you were my false passport--
I am mountainous!
The slightest touch
Boils my blood like a flame
And you are cold,
Like a drop of dew on a petal!

## SNOW-STORM

It was a snowstorm.
In the dusk, I made a nest of my own palm
For a wandering snowflake.
I gazed on it like a lover.
When it melted, I recognized it--
A drop of water in Kurdistan!

## YOUTH AND OLD AGE

However I may try
I cannot distinguish youth from old age.
I worship both:
At dawn-the sunrise
At evening-the sunset
Ravish me.

## MARTYR

Last night I left my bed,
Held up my thunderful head
Towards the sky.
I saw thousands and thousands of stars,
Scattered about,
Like seeds of pomegranate.
I came back, and remained sleepless
With sorrow for those stars
That fell down prematurely.
Translated by: Abdulla Pashew and Rikki Ducornet



عبدالله بَشيو

# منذ ميلادي، وأنا أحلم

(مقتطفات)

منذ ولدتُ، وأنا أرى
أحلاماً مخملية، زاهية،
عالية كالنجوم،
خاطفة كالصوت والضياء.

***

منذ ولدتُ، وأنا أزرع الأحلامَ،
يوماً يوماً، عاماً عاماً،
تخوماً تخوماً، بيتاً بيتاً،
أزرع الأحلام.

***

حيناً، عندما أكتب،
كلمات، أراها تتمرد هنا وهناك:
جَفلة، نائية،
أحاول امساكها، لكنها تفرُ،
وإن غفوتُ،
وجدتها قفير نحل، يحبك في قحف رأس
خلايا الشعر،
وحيناً، أرى سنجاباً وجلاً،
يهرب مني، من غصنٍ إلى آخر.
وإن غفوتُ،
وجدتُ السنجاب نفسه، يرقص فوق كفي.

***

حرب النجوم،
تشيرنوبل،
أطلال حلبجة،
قناع مايكل جاكسون،
زرع الانسان في الأنابيب الزجاجية،
الأنترنيت، والثقوب في طبقة الأوزون
كلها، تفزعني في صحوي،
لكن، حين أغفو،
أرى الكون جنة عذراء
والنجوم في أوائلها، تقشّر الظلام،
متدلية كثمر السفرجل،
من أغصان السماء.

***

في صحوي،
نبدو قطراتٍ من ماء مذعور،
تحت وهج الشمس،
في غفوتي
أرى بأننا نرتوي بالشعاع،
ونجري كالنهر الهادر.

***

منذ أن ولدتُ، وأنا أحلم:
حلمتُ بحبيبتي،
أربيلية سمراء،
كانت تنتظرني في المطار،
في يدها باقة من الحندقوق،
قبل أن أنهمر عليها بالقبل،
قبل أن أشدَّها إلى صدري،
تسألني عن أمسيتي الشعرية في دياربكر،
وفي لحظة أخرى..
أقرأ قصائد رخيمة في مهاباد، فتصفق قامشلي.

***

كنتُ دوماً، هكذا..
ولازلتُ، كما كنتُ:
منذ أن ولدتُ، وأنا أحلم.
منذ أن ولدتُ، وأنا أزرع الأحلام.
حيناً أتحسس نبض جبل "حمرين"، بيد،
وبالثانية أسرِّح مويجات بحيرة "وان".
في غمضة عين
أغرس إحدى قدمي في "هورامان"،
وأرفع الثانية صوب عفرين،
لأزيِّن جيد "اللاوك"، بشال "السياجمانه".

***

منذ أن ولدتُ، وأنا أحلم.

منذ أن ولدتُ، وأنا أزرع الأحلام.

أرى نفسي في بريد مدينة "بايزيد"،

ألمح "خاني"، محاطاً بهالة من النور،

أقترب منه،

أندهش وأبهتُ،

أراه مرتبكاً مثلي،

أنا، حياءً من جلاله وهيبته،

وهو، كي يبعث بالأكسبريس زوج حذاء

لتلميذه الكويسنجقي إلى "بالك".

***

منذ أن ولدتُ، وأنا أحلم.

منذ أن ولدتُ، وأنا أزرع الأحلام.

حلمتُ بأنَّ برقاً صعقني،

مددني أصدقائي على دكة غسل الموتى،

تحت ظل شجرة البطم.

تجمعتِ السيولُ حولي، واستحالت إلى جداول،

والجداول إلى نهر هادر،

تطير فوقها أسراب الكراكي،

امتزج الرذاذ بالشعاع، والشعاع بالضباب،

هبَّت نسمة سماوية، فهزَّت أرجوحة الكون،

كانت أوراق الياسيمن رذاذاً،

والسماء تنثر نجوماً بلون البطم.

عندما كفَّنوني..

انفتح الكفنُ فجأة،

وارتفع رويداً رويداً...

حتى صار قوس قزح،

ثم هبَّت الريح،

وخفق قوس قزح، مثل راية.

***

منذ ولدتُ، وأنا أرى

أحلاماً مخملية، زاهية،

عالية كالنجوم،

خاطفة كالصوت والضياء.

منذ ولدتُ، وأنا أزرع الأحلامَ،

يوماً يوماً، عاماً عاماً،

تخوماً تخوماً، بيتاً بيتاً،

أزرع الأحلام.

٢٠ . ٤ . ١٩٧٧، هيلسنكي

**اشارات:**

* وان: بحيرة قريبة من مدينة وان، شمالي كردستان.

* هورامان: منطقة جبلية شاسعة، تقع على طرفي الحدود الإيرانية والعراقية الرسمية.

* اللاوك: لون غنائي شعبي كردي، خاص بقاطني شمالي وغربي كردستان، الناطقين باللهجة الكرمانجية.

* اشارة إلى قصيدة الحاج قادر كوي - القرن التاسع عشر - التي بعثها من استنبول إلى صديقه االشاعر الحاج عبدالله جليزاده، حيث يذكره فيها بدراستهما في منطقة بالك، وهم حفاة.

* خاني: الشيخ أحمدي خاني، أكبر شاعر كردي كلاسيكي، من القرن السابع عشر، صاحب أشهر ملحمة شعرية: " مم وزين".

آهذه القصيدة، مختارة من كتاب شعري للشاعر، معد للطبع بالعربية، وهو الكتاب، يشمل مختارات شاملة من أعماله، وترجمها إلى العربية نخبة من الشعراء والمترجمين، وقام باعادة صياغتها من جديد الشاعر عبدالله بيشو، ومحمد عفيف الحسيني آ

# چەند نموونەیەک لە شیعرەکانی پەشێو بە ڕێنووسی لاتینی

**WANEYEK BO MINALAN**

Minalekan!
Ewey denke genimêkî çand,
Gule genimî dirwêne kird.
Ewey dilopêk xwênî çand.
Tabloyêkî bo xoy nexşand.
Ewey tenya hawarêkî le dem der çû.
Gwêy le seday dengî xoy bû,
Ke çî ême,
Kaseser û çaw eçênîn,
Baranî xwên be seryana ebarênîn
Hêşta werzî dirwêneşman diyar niye.
Ta gule genimêkî kelgey ew xwênesman diyar niye!

Minalekan!
Ba ew cogeye bigorîn
Ke xwênmanî pêda derwat,
Ba ew zemîneş bigorîn
Ke çaw û kaseser dexwat
Înca, werzî dirwênetan bo rist dekem!

Minalekan!
Ke wanekan exwênînewe,
Eger roj bû,
Le kuncêka kip heltûtên
Eger şew bû,
Ba çirakan kiz bisûtên
Çak ezanim,
Gewrekantan bitanbînin,
Daxtan eken
Wanekanim esûtênin,
Dên dûbare
Cesitey Hellac edenewe le sêdare.

**

**TABLOYEKÎ ZISTANÎ**

Em şew destim bo ferhengî nîweşey bird,
Wişekanî mêrûle bûn,
Le ber demma rayan dekird.
Ew minaley êware dîm,
Le sêbarî mizgewtêka,
Birsêtiy le xoy lûlda bû,
Dawelî xway xoy depêka;
Em şew, lay min, mîwanêke,
Le bin mîçî jûrekema rakişawe;
Be pence lawazekanî estêrekan desrêtewe.
Beri kilawrojney girtûm,
Lê nagerê,
Bo biskoley kirawey mang bikrêtewe

**Ey mîwane biçkolekem!**

Bo man degrî?
Çît lêm dewê?
Were xwarê,
Beyanî zû kilafey rê dekemewe,
Qasey asot bo deşkênim,
Kulêrey zêr derdehênim,
Were xwarê,
Serî estêrekan mabire,
Lêfey Eyyûb be xot da de
Ta dirûşmî ser taqekan desûtênim
Çîlkey pencey tirsnokî şaîrekan,
Kursî w mêzî jûrî koske samnakekan desûtênim
Beyanis zû,
Le bîr nakem;
Klafey rê dekemewe,
Qasey asot bo deşkênim,
Kulêrey zêr derdehênim.
Were xwarê...
Serî estêrekan mebire,
Berî kilawrojne megre
Ey mîwane biçkolekem

**

**RASTÎ PERWANEYEKE**

Rastî perwaneyeke
ger detewêt pêy bigeyt
dagirsêne çiraket!
To dîlî,
çon dîl dekujî?
Hey hezar tif û lanet
le gewrêy to û biraket

**

**PÊŞEKÎ DUWEM**

Bûkiyan dizî,
Zûrnaman xoş!
Bûkiyan kirî,
Deholman xoş!
Bûk êwe xoş,
Helperkêy naw seholman xoş!
Zawa helse!
Helse, rabe!
Zurnakanyan wird û xaş ke
Zimanekanyan le aş ke!

**

**LI BER DERGE Şew reşika**

Ejnom şil bû
Mang be taqî asmanewe helpirûka Dergeketim lê bikewe.
Em şew hatûm
Bo çinînî çepke nêrgizekî çawit,
Bo nûçdanê,
Bo xewnê... toze giryanê,
Le ser hewrî qijî xawit.

Em şew hatûm,
Tirûskey şarî yadigar bangî kirdûm
Legel xemî şorebîma
Hatûm û nagerêmewe,
Ya pêtdekem
Ya wek momêk, desûtêm û detiwêmewe!

Dergeketim lê bikewe
Her dildarekey caranim
Her kêlgekey ber dergetim,
Her tîniwekey kirewe w lêzimey baranim.
Dergeketim lê bikewe,
Min ew kesem,
Ta dwênê bû
Le naw geruy rûnakî da detişardimewe
Le naw camî metirsî da detxwardimewe.
Kat
Le jêr balî asman da,
Xerîke bawêşk dedat,
Şwên
Quléreşekî kipe
Dergeketim lê bikewe
Şitêk niye şîrîntir bê.
Le xişpey pê w cirpey cipe!

Dergeketim lê bikewe,
Kift û mandûy rêgey dûrim;
Wekû caran
Kemêk le lat demênimewe w radebûrim

Şew raşika,
Ejnom şil bû,
Mang be taqî asmanewe helpirûka; Dergeketim lê bikewe
Dar û berdî ber dergetan hatne dika!

**

## LE DAYIKBÛN

Gwêm le hawarî netewekeme
Belam dilniyam,
cîhanî sibey guşad û rûne.
Le dayikbûnî minalim dîwe;
Boye dezanim,
qîrew lîngkutan
yekem nîşaney le dayikbûne

**

## EWPERÎ TÎNWÊTÎ

Maçit dekem
Ey giyanî xom maçit dekem.
Qortî çenaget maç dekem
Nermanî gwêt,
Goy memkekanit maç dekem.
Zor tînûtim
Le gel ewey, cak dezanim,
Memkekanit, wek tope xwê,
Te maçiyan kem,
Nemamî zerdî tînwêtî
Le êskimda pitir derwê!
Ey giyanî xom
Le yekem korsî ewîn da
Memkekanit fêryan kirdim
Rêzî befrî çiyakan bigirim
Çawekanit fêryan kridim,
Rêzî kaniy binarî şaxekan bigirim.
Demewê bigerêmewe.
Bo ser textey qutabxane:
Çawrêt kem,
Le duwem kosrî ewîn da,
Fêrim bikey memkekanit biparêzim,
Fêrim bikey cawekanit biparêzim.

**

## BO QERECÊK

Yekem:
Bes temaşayî naw lepim ke!
Xo min namewêt pêm biley,
Debim be bawkî çend minal;
Zengîn debim, yan her wa lat.

Tenya ştêkim pê bilê!
Ta mirdin wek to dejîm,
yan debim be xawen wilat?

**

## BOM NANÛSRÊ

Bom nanûsrê.
Be xwên nebê bom nanûsrê
Nûkî rimekantan tîjken,
Xencertan siwarî hesan ken
Serapay leşim bikene kêlgey birîn,
Min rahatûm,
Xwên bikeme merekebî şi'îr nûsîn...!

**

## ASMANÎ TO BER PÊY XOTA

Serit þorke!
Milit keçke!
Çaw megêre bo estêrew asman û Xwa!
Ewey bistêk xakî nebê
Xwaw estêrew asmanî kwe?

**

## ALBUM

Giftit damê
Wêney ewanan nîşandey
Ke mom asa,
Le şewgarî jinta helbûn, hiy ewaney xoşit dewên,
Hiy ewaney xoşit wistûn.
Lew rojewe giftim daytê
Le soraxî albomê kam, ke wa dû toy
Wêney hemû afretanî
Em cîhane bigre te xoy!



# Waakzaamheid

Tweederde van de nacht is voorbij
Slaap mijn kind
Nestel je in mijn schoot
Rust in mijn armen
Wacht niet op mij
Vannacht zal ik waken
Ik zal niet slapen
Je vat de slaap gemakkelijk
De natuur is bars en haar adem is luid
Ik ben bang dat het huilen van de wind
Het ruisen van de bomen
De bulderende wolken
De stortregen
Jou wakker zullen maken
Of je in je dromen zullen storen
Slaap mijn kind
Nestel je in mijn schoot
Slaap in mijn armen
Wacht niet op mij
Ik zal over je waken
Ik zal niet slapen

*Abdullah Pashew*

# De onbekende soldaat

Wanneer een buitenlandse delegatie een land bezoekt
neemt zij een krans van bloemen naar de graftombe
van de onbekende soldaat.
Als morgen
een delegatie naar Kurdistan komt
en mij vraagt: Waar is de graftombe
van de onbekende soldaat?
Zal ik zeggen, Mijnheer
aan de oever van elke rivier,
op de bank van elke moskee,
voor de deur van elke kerk,
voor elke grot,
op iedere rots in de bergen,
onder alle bomen in de tuinen,
in dit land,
op elk stukje grond,
onder elke meter van de hemel,
maak je geen zorgen; buig een beetje lager
en leg je bloemenkrans neer.

*Abdullah Pashew*



لەڕاستەوە بۆ چەپ: مەحمود زامدار، عەبدولقادر محەمەد ئەمین، پەشێوە، مستەفا شێواو



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: نەناسراو، ماجد عەبدوڵلا، عەبدوڵلا پەشێو، عەبدولقادر محەمەد ئەمین نەناسراو



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: نەناسراو، نەناسراو، عەبدولقادر محەمەد ئەمین، عەبدوڵلا پەشێو، ماجد عەبدوڵلا



چوارەم کەس لە چەپەوە: ١٩٦٦/٤/٢ دالوکۆل



له ڕاستەوه: عەبدولقادر محەمەد ئەمین، ماجد عەبدوڵڵا، عەبدوڵڵا پەشێو



دانیشتووەکان له ڕاستەوه: عەبدولقادر محەمەد ئەمین، عەبدوڵڵا پەشێو، نەناسراو، تەها، نەناسراو، نەناسراو، تەحسین، بەکر کۆیی



له ڕاستەوه: نەناسراو، عەبدوڵڵا پەشێو، ماجد عەبدوڵڵا، عەبدولقادر محەمەد ئەمین



دانیشتووەکان له ڕاستەوه: قادر پیر داود، عەبدولقادر محەمەد ئەمین، تەحسین، بەکر کۆیی، عەبدوڵڵا پەشێو



لەڕاستەوە: ئۆرخانی غالب، عەبدوڵڵا پەشێو



# بەفرەلۆك

دڵشاد عەبدوڵڵا

قوتابخانەکەمان دوو نهۆمی بەرزو حەوشەیەکی گەورەی هەبوو، نیوەی چیمەنتۆو نیوەکەی تری گڵ بوو، من حەزم لە پیاسەی ناو حەوشە گڵەکە بوو، بەتایبەتی کە لەوێوە چیای سەفین بەجوانی لەو دوورەوە دیاربوو.هەوایەکی پاك لەلای باکوورەوە دەهاتو هەناسەمانی پڕدەکرد لە بۆنێکی خۆش، بۆنێك کە ئێستا نازانم هی چی بوو؟ هی گوڵە پرتەقاڵی ماڵەکانی دەوروبەری قوتابخانە، یا هی دەشتو دەربوو دەهاتە ناو شارو یەکەم جار بەر لووتو هەناسەی ئێمە دەکەوت! لەبەر ئەوەی لە ماڵەوە شوێنی خوێندنم زەحمەت بوو، بۆیە دوای دەوامیش پشوویەکی کەمم دەداو ئیتر بۆ خوێندن دەچوومەوە هەمان قوتابخانەو لەبن دیوارەکان دا بەهاتووچۆ دەرسمان دەور دەکردەوەو چەند برادەرێکیشمان دەدیو لەکاتی پشودا قسەوباسی جۆراوجۆر دەهاتە گۆڕێ. رۆژێکیان برادەرێك دەفتەرێکی شیعری فەرید زامداری بۆ هێنام کە بەدەست خەتێکی جوانو بەجۆرەها ڕەنگ نووسرابووەوە، خوێندمەوە. پێدەچوو هەموویان چوارینە بنو لاسایی ئەو شاعیرانەی تێدا کردبێتەوە کە چوارینەیان نوسیوە، بەگشتی شیعرەکان دلداری بوون. پێدەچوو ئەو کات فەرید تازە دەستی بەشیعر نووسین کردبێ، چونکە لەو دەستنووسە ئەو هێمایە دیاربوو. لەو ماوەیەدا هەندێك لە دیوانی شاعیرانی کلاسیکی کوردم خوێندەوە لەگەڵ دیوانێکی کامەران موکری. دواتر بۆ خوێندن دەچوومە کتێبخانەی گشتی کتێبی زۆرترو هەمە جۆرترم دەست کەوتو کتێبەکانی سەلامە موساو هەندێك لە دیوانەکانی بەدر شاکر سەیابو بەیاتیو نزار قەببانیم خوێندەوە. کە عەبدوڵڵا پەشێویشم ناسی سوودی زۆرم لە کتێبخانەکەی وەرگرتو لەوێ هەندێك کتێبی مەنفەلوتیو چیم دی ئەحمەد خواجەو فرمێسکی نهێنی جەمال شاربازێڕیو هەندێك لە کتێبەکانی جەبران خەلیل جەبرانم خوێندەوە. برادەرایەتیم لەگەڵ عەبدوڵڵا پەشێودا لە قۆناغی ئامادەیی‌دا دروست بوو. پەشێو بۆ من هێمای شاعیریەتی بوو، چ لە قسەکردنو هەڵسوکەوتو چ لە نووسیندا. زمانێکی پاراوو ڕەوانو بێ گرێ، ڕستەکانی کورتو پڕ، بەئاسانی دەچوونە دڵو بەزەحمەت دەهاتنە دەرێ. ئەو بەتەمەن لەمن گەورەتر بوو، بەڵام زۆر ڕووخۆشو متوازیع بوو، ئەوەندەم هەوەس پێ دەهات کە گوێی لێ دەگرتم کاتێك ڕاو سەرنجێکی خۆم دەردەبڕی، یا گفتوگۆم دەربارەی بابەتێك درێژە پێدەدا. دوورکەوتنەوەی پەشێو لە تەمەنێکی زوودا لە هەولێر زیانێکی زۆری بەباری ئەدەبی ئەو شارە گەیاند، ئەگەرچی کەسایەتی پەشێو وەکی هەموو هەولێریەکی تر لێوانلێو بوو لە نامۆییو جۆرێك لەشەرمو گۆشەگیریو هەر ئەوەش وای لێکرد نەتوانێ پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەدیبانی ئەو شارە پەرەپێبدات، ئەویش دواجار بچێتەوە ناو بازنە سووتێنەرەکەی نامۆییو دووررو نزیك بایەخ بەوانەش نەدات کەلە دوای ئەو لە شارەکەیدا شیعریان هەڵگیرساندووە لەناو شەوەزەنگی بێدەنگیدا.

پەشێو لە شیعردا ڕووی دەمی لەکۆ بوو، بۆ کۆ دەینووسی. لەدەرەوەی خۆیدا دۆن کیخۆتە بوو. شمشێری لەڕووی زوڵمی کۆمەڵایەتی هەڵکێشا بوو، لەڕێی موعاناتی عەشقو دڵدارییەوە گرفتەکانی لەگەڵ دەسەڵاتە باوەکان گەیشتبووە لوتکە. پەشێو شاعیرێکی یاخی بوو لە بەرانبەر ئەو زوڵمەی یەکەمجار لەخودی خۆی کرابوو، بارتەقای ئەو زوڵمە شیعری دەهۆنیەوە. لای ئەو هاوکێشەی (ژن-نیشتمان) فرە ڕەنگو فرە مەعنابوو، بەڵام کام ژنو کام نیشتمان؟ ژنێك کە پەشێو لەژیانی خۆیدا وەفاو خیانەتەکانی دەبینێ، بێدەربەستیو هەڵخەڵەتاندن و ڕاستگۆییەکانی، پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوەکانی، نیشتمانیش بەهەمان شێوە. هەر تەنیا ئەو ئاڵایە نەبوو کە بەدەستی شۆڕشگێڕێکەوە دەشەکایەوە، بەڵکو ئەو شمشێرەش بوو کە بەسەر تەوقی سەرەوەو هەردەم هەڕەشەی مردن دەکا. نیشتمانیش پەیمان دەبەستێو پەژیوانیش دەبێتەوە، ڕۆڵەکانی دالدە دەداو بێ لانەشیان دەکا!

پەشێو هەمیشە وەکی گوڵە بەرۆژە ملی لارکردۆتەوە بەرەو لای ژنو نیشتمان.

